بسم الله الرحمن الرحيم
"أَوَمَنْ كَانَ مَيْتاً فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُوراً يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا"

# ماڵکوڵم ئێکس
# پەیامی ڕابوونی گەلان

فاضل قەرەداغی

تێبینی: بۆ ژیانی ماڵکوڵم ئێکس سوودی گەورەم لە یادداشتەکانی وەرگرتووە "بەپێشەکی و پاشکۆوە"، زۆرجار زۆر تەعبیری ماڵکوڵم وەکو خۆی دووبارە کردۆتەوە، دەشتوانین ئەم نامیلکەیە وەکو کورت کردنەوەیەکی یادداشتەکەی لە ئامادەکردنی "ئێلیکس هالی"و وەرگێڕانی بۆ عەرەبی ( 1986) بزانین، ئەوەندەش بزانین ماڵکوڵم جگە لە باسی ڕۆژنامەو گۆڤار کتێبێکی هەیە بەناوی (ڕاستیی بزووتنەوەی ئیسلامی) کە دەربارەی ڕێکخراوی (نەتەوەی ئیسلام)ـە.

چاپی یەکەم ١٤١٣ك-١٩٩٢ز
چاپی دووەم ١٤١٩ك- ١٩٩٨ز ( بەدەستکارییەوە )
چاپی ئینتەرنێت ١٤٢٥ك -٢٠٠٤ ز ( بەدەستکارییەوە )

## پەیامی وریابوونەوەو ڕا پەڕین

پەیامی مالکۆلم ئێکس هەر بۆ ڕەشەکانی ئەمریکا نەبوو، پەیامەکەی بۆ هەموو گەلێکی ستەملێکراوە.. پەیامی ڕاپەڕین و هەستانەسەرپێ.. لەپێناو ئەم پەیامەدا ئامادە بوو بکوژرێت.. لەڕێی ئەم پەیامەشدا کوژرا.

مالکۆلم ئێکس لەگۆمێکی تاریکدا دەژیا: تلیاك خواردن، تلیاك فرۆشتن، گەوادی، دزی،.. ئیسلام ئەو و هەزارانی وەکو ئەوی خەبەر کردەوە، ڕایچڵەکاندن، کردنی بەپەیامهەڵگر، پەیامی وریابوونەوەو ڕاپەڕین.

لەئەمەریکادا مرۆڤی ڕەشپێست هەمیشە زللەی دەخوارد کەچی چۆکی دا دابب، مالکۆلم فێری کرد بەپێوە هەستێ، بەرەوڕووی "ئاغا" سپیپێستەکان بوەستێ.

"پێشەوا"ی ڕەشەکانیش لەهەموویان خراپتربوون.. ملیان کەچ دەکردو دەستی سپیپێستان ماچ دەکرد، چەندیش زیاتر ماچیان دەکرد ئەوەندە زیاتر پیاوی سپی تفی لێ دەکردن، چەندیش زیاتر پێڵاوەکانیان دەلستەوە ئەوەندە زیاتر پێی دەخستە سەر کەللەیان.

بەداخەوە ئەمڕۆ میللەتەکانمان هەر بێ دەسەڵات و ژێر دەستە نین، میللەتەکانمان بەرەو ئەو مێشك سڕینەوەیە دەچن کە مالکۆلم ئێکس کات و ژیانی تەرخان کرد بۆ لەناوبردنی، بنەمایەکی ئەم مێشك سڕینەوەیە دەلێت:

"شت چەند ڕۆژئاوایی تر بێت ئەوەندە باشترە"

وەك چۆن لای ڕەشەکانی ئەمریکا ئەم بنەمایە هەبوو:

"شت چەند سپی تر بێت ئەوەندە باشترە"

کەسانیش هەن لەناو میللەتانی ڕۆژهەڵاتدا خۆیان کردۆتە پێشەوا، هەروەکو پێشەوایانی ڕەشەکان، هەروەکو "کوڕەکانی مام تۆم"، ئەو دەستە ماچ دەکەن کەبەر زللەیان دەدات و ئەو پێڵاوە دەلێسنەوە کەسەریان پان دەکاتەوە.. بەمەش ڕازی نین: واخەریکە میللەتیش ڕووەو ئەم چارەنووسە زەلیلە دەبەن.

کەسانێکمان دەوێ وەکو مالکۆلم ئێکس پێمان بلێن: بەسە چۆکدادان، چاو بکەنەوە، هەستنەسەر پێ، فێرمان بکەن بە "ئاغا"کان بلێین بەسە یاری کردن بە میللەتانمان..

کەسانێکمان دەوێ وەکو مالکۆلم ئێکس مێشکمان پاك بکەنەوە لەو درۆیەی کە "شت چەند ڕۆژئاوایی تر بێ ئەوەندە باشترە"، فێرمان بکەن چۆن هەوڵ بدەین هاوشانی ئەو "ئاغایانە" ببین، بەرەو ڕوویان بوەستین، بیانبەزێنین.

دەمانەوێ وەکو مالکۆلم ئێکس ئابڕووی "کوڕەکانی مام تۆم"، بووکەشووشەکانی سەر شانۆ بەرین.

وەك چۆنیش مالکۆلم ئێکس بە سپییەکانی وت: "ئەو ڕەشپێستەی ئەوسا دەتانناسی مرد"، دەمانەوێ وەکو ئەو بلێین: ئەو میللەتەی ئەوسا دەتانناسی.. مرد.

دەمانەوێ.. هەزار شتمان دەوێ.

با هەنگاوی یەکەم بنێین،

با لاوەکانمان بێنەوە هۆش خۆیان،
میللەتیش بێننە هۆش خۆی،
پێی بلێن، هاواری لێ بکەن:
بەسە چۆکدادان،
چاو بکەرەوە، هەستە سەرپێ، ڕاپەڕە

## ڕەشەکانی ئەمریکا.. خوێی سەر برین

"وێنەی کۆیلەو ئافرەتی ڕەش، بەستراون‌و بەقامچی لێیان دەدرێ، دایکانی ڕەشپێست تەماشای پیاوە سپێپێستەکان دەکەن منداڵە شیرەخۆرەکانیان لێ دەسەنن‌و ئیتر قەت نایانبیننەوە، سەگەکان کۆیلەکان ڕاو دەنێن، پیاوان بەقامچییەوە کۆیلە ڕاکردووەکان ڕاو دەنێن، تێلاّ، زنجیر، تفەنگ.."[1].

"لەوپەڕی گەرمەی ئەم بازرگانییە "بازرگاییی کۆیلەی سەدەی هەژدەی زاینی" بەریتانیا "١٩٢" پاپۆڕی هەبوو کەخەریکی بازرگانیی کۆیلە بوون‌و لەهەر سەفەرێکدا "٤٧" هەزار ئەفەریقایی دەبرد..".

"گۆڤاری لایف-١٩٥٧: "١٤" ملیۆن "ئەفریقایی" گەیشتنە جیهانی نوێ.. "٤٢" ملیۆن ئەفریقایی مردن پێش ئەوەی بگەنە عەمارەکانی لێواری ڕۆژئاوای ئەفەریقا بۆ ڕاگواستن بۆ جیهانی نوێ"[2].

"لەویلایەتەکانی باشووری "ئەمریکا" ئازادیی ڕەشپێستێك -بەڵکو ژیانیشی- هەڕەشەی لێ دەکرێ ئەگەر گومانی لێ بکرێ بەتەمای مانگرتنە".

"لاوێکی ڕەش ساڵی ١٩٥٧ لە کارۆلاینای باکووردا گیرا چونکە ".." تەماشای ئافرەتێکی سپی کرد".

"لەوانەیە بڕوا نەکەین: زۆر ئەمریکی لایان سەیر دەبێ ئەگەر بزانن کەوا ڕەشپێستان وەکو مرۆڤ هەموو هەستە مرۆڤایەتییەکانیان هەیە"[3]

هیچ دیمەنێك وات دەبینی لە فلمە ئەمریکییەکاندا؟

دەزگا ڕەسمی‌و نارەسمییەکانی ڕاگەیاندن لەئەمریکادا، وەك چۆن بلێیت ڕێك کەوتین، ئەمریکا وا پیشان دەدەن کەهەموو شتێك تیایدا بە ئاسانی دەڕوات، هەتا فلمەکانی کوشتن‌و برینیش: دەبینین پاڵەوانێك پیاو

---

[1] مذكرات مالكولم X.. زعيم الزنوج المسلمين في أمريكا ص١٦٠.

[2] ئەم دوو پاراگرافە لە: طاهر عبدالحكيم، إضطهاد الزنوج في أمريكا ١٩٥٨، ت١٢-١٦.

[3] ئەم سێ پاراگرافە لە: ئێرێك لنكۆڵن، المسلمون الزنوج في أمريكا ١٩٦٤، ل٥٣-٥٥.

خراپان لە ناو دەبات.. لەکۆتایشدا ئەنجامی ناڕاستەخۆی ئەم فلمانە: شیرین کردنی "شێوازی ژیانی ئەمەریکایی".

سەرۆك "لنکۆڵن" لەسەدەی ڕابردوودا بڕیاری ئازادکردنی کۆیلەکانی دا، ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا سەرپێچیان کردو جیا بوونەوە، شەڕ بەرپا بوو ئەو ویلایەتانە بەزێندران، لنکۆڵن بڕیارەکەی بۆ بەسەرچوو بەڵام ئایا ئەگەر کۆیلێتی نەمابووبێ ڕەگەزپەرستی لەئەمریکادا بنەبڕکراوە؟[٤]

لەهەموو ئەمەریکادا، باکوورو باشوور، ڕەگەزپەرستی هەیە، لەهەموو شوێنێکدا سپیپێست "بەرزترە" لەڕەشپێست، بەڵام باکوور دووڕووە.. ماڵکۆڵم ئێکس وەکو موسڵمانەکان و بەپێچەوانەی دوژمنەکانی تری ڕەگەزپەرستی –باشووری لا باشتربوو چونکە ڕەگەزپەرستییەکەیان ناشارنەوەو بە ئاشکرایی دەریدەبڕن، جگە لەم ڕاستگۆییەی شایەنی ڕێزە، ئەم ئاشکراکردنەی ڕەگەزپەرستی ڕەشەکانی ئەوێی هاندابوو زووتر بکەونە جموجووڵ لەکاتێکدا سپییەکانی باکوور توانیبوویان ڕەشەکان بەنج بکەن.. قسەی هەڵخەڵتێنەریان بۆ دەکەن و پەیمانی درۆیان پێ دەدەن، دوایش هیچ ئامانجێکیان بۆ بەجی ناهێنن و وەکو ئەمەریکییەکانی باشووریش بەهیچیان نازانن.

لای ماڵکۆڵم دوو پاڵێوراوەکەی سەرۆکایەتیی ئەمریکا وەکو یەك خراپن، بەڵام (گوڵد ووتەر) –لەحزبی کۆماری– "گورگ" بوو، بۆیە لە (جۆنسۆن) –لەحزبی دیموکراتی–ی "ڕێوی" باشتر بوو.

بەهەمان جۆر "پارێزگاران"و "لیبڕالەکان" یەك هەڵوێستیان هەبوو بەرامبەر ڕەشەکان "با ڕەشەکان لەجێی خۆیاندا بوەستن"، بەڵام لیبڕالەکان ئەمەیان زیاد دەکرد: با وا خۆمان پیشان بدەین کەبەهەندێك داواکاریی ڕەشەکان قایلین.

تاماوەیەك لەمەوبەر ڕەشەکانی باشوور خەریکی جموجووڵی بەناوبانگی (دانیشتن) بوون. هەر یەك لە ڕەشپێست و سپیپێست پاسی تایبەتیان هەبووو بەم جۆرە تێکەڵ بەیەك نابن بەڵام بەپێی بزاڤی (دانیشتن) ڕێگە بە ڕەشەکان بدرێ لەیەك پاسداو بەتێکەڵاوی لەگەڵ سپییەکاندا دانیشن.

با ئەمەیان دەستبکەوێ.. گرنگ ئەوەیە: ئایا دەتوانرێ وا لە سپییەکان بکرێ بە مرۆڤیان بزانن؟ ماڵکۆڵم ئێکس گاڵتەی بەم جۆرە خەباتانە دەهات، ڕەشپێست خەسێنرابوو و لەپیاوەتی –بەڵکو لە مرۆڤایەتیش– خرابوو ئیتر (دانیشتن) چی بۆ دەکات؟

ماڵکۆڵم کە ل ەباشووری ئەمەریکادا سەرەتای ژیانی خۆی بردبووەسەر باشترین شایەتە بۆ باسی "پلەو پایە"ی ڕەشەکانی ئەوێ:

---

[٤] بەڵام با بەمە نەخەڵەتێین، ئەوەتا جێفەرسۆن Jefferson کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی دەستووری ئەمریکی و سەرۆکێکی ئەمریکا بوو زۆر پێش لینکۆڵن لایەنگرێکی گەورەی نەهێشتنی کۆیلێتی بوو بەڵام ئەوەی پشت گوێ خست شەش منداڵە ڕەشپێستەکەی کەلە ژنە ڕەشەکەی بوون ئازادبکات بڕوانە:

**Catherine David, Black Power, histoir d'une dérive, TéléObs, no. 141, 11-17/5/1996, p.3.**

لنکۆڵنیش خۆی لەوتارێکدا دانی بەوەدا نابوو کە لەو بڕوایەدا نییە کە سپیپێست و ڕەشپێست یەکسانن.

لەسپییەکانی سەدەی بیستدا لەشاری (لانسینگ)ی سەر بە ویلایەتی (مشیگان)دا ڕەشپێستی "سەرکەوتوو" هەبوون. "سەرکەوتوویی" لەئەمریکادا دەستکەوتنی پارەی زۆر یان پایەی بەرزە:

"سەرکەوتووان"ی لانسینگ "بۆی" یان "بۆیاخچی پێڵاو بوون".

"هەڵبژاردە"ی ڕاستەقینە، "دەسەڵاتە هەرەگەورەکان"، "قسەکەران بەناوی ڕەگەزی ڕەش" خزمەتکاری ئەسپەکانی یانەی "لادێ"ی لانسینگ بوون یاخود بۆیاخچی پێڵاوبوون لەپەرلەمانی ویلایەتی میشیگان..".

باسی خێزانی "لیۆنز"ی شاری "ماسۆن"ی ویلایەتەکە دەکات کە مستەر "لیۆنز" وەرزشەوانێکی دەرکەوتووبوو:

"بەم جۆرە ڕێزی دەگیرا لەلایەن هاوڵاتیانی شارەکەوە، بەهۆی ئەمەشەوە دەیتوانی کاری ناو ماڵانی دەستبکەوێ"!!

هەرچەندە ماڵکۆلم باشترین قوتابی بوو بەڵام مامۆستا سپییەکە لای سەیر بوو کاتێك لە ماڵکۆلمی پرسی دەربارەی دواڕۆژیی و ئەم وەڵامەی دایەوە کە دەیەوێ ببێتە پارێزەر:

"تۆ قولە ڕەشی Negro، دەبێ واقیعی بیت، بۆچی نابیتە دارتاش؟"

مامۆستاکە وەکو هەموو پێست سپییەك بیری دەکردەوە، دوا ڕۆژی ڕەشەکان لایان ئەوەیە "لە جێی خۆیاندا بمێننەوە".

لەڕەشەکان ژیان خراپتر ئەو ((سپی))یانەن کە بە ڕەگەز ڕەشن، واتە ڕەگێکی ڕەشیان تێدایە بەڵام بەڕوویانەوە دیار نییە، ئەمانە لەدۆزەخدا دەژیان چونکە ئیمکان بوو ڕۆژێك کابرایەك خەبەریان لێ بدات، ئەمانە بەهۆی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ سپییەکاندا -کەسیش نەیدەزانی کەڕەشن– ئەو قسانەیان دەبیست کە سپییەکان نێوان خۆیان بەڕەشەکانیان دەوت، ماڵکۆلم دەیبینی چۆن دەتەقینەوەو دەمیان پڕ دەبوو لە قسەی ناشیرین دژ بە سپییەکان.

بەڵام لە ((ڕەگەزپەرستی))و ((بارودۆخی خراپی ژیان)) خراپتر ((مێشك سڕینەوە)) بوو، ڕەشپێستەکان لەسەر "ڕاستییەك" پەروەردەکرابوون:

"شت چەند سپی تر بێت باشترە"

کۆنك Conk دیاردەیەکی ئەم مێشك سڕینەوەیەیە، ڕەشپێستەکە گیراوەیەکی سووتێنەر دەدات لەقژە لولەکەی تاکو زەردو خاوی بکات.. دەموچاوی ڕەش و قژی زەرد! قژی زەرد هی سپیپێستەکانی بۆیە "باشترە"!

ماڵکۆلم فێری ئەم کارە ببوو و دەستی دابووە قژ خاوکردنەوە:

"بەم جۆرە.. یەکەم هەنگاوم نا ڕووەو سەرەولێژبوونی خودی خۆم"

باسی ڕەشەکانیش دەکات:

"تەماشای دەوروبەرت بکە لەهەر شارێکدا (..) پیاوان دەبینی قژە لوولەکەیان خاوکردۆتەوە، هەروەها ئافرەتی ڕەشی خاوەنی قژی دەستکردی سەوزو مۆرو ".." کە شایەنی گاڵتە پێکردنن هەروەك بووکەشووشەی سەر شانۆی بووکە شووشان، مافی خۆشتە ئەو کاتە بپرسیت ئەگەر ڕەشپێستەکان مێشکیان لە دەست نەدابێت‌و پێوەندییان بەخودی خۆیانەوە مابێت"

ماڵکۆڵم ڕەشەکانی ڕاچڵەکاند، زۆریانی فێری ئەوەکرد کەشەرم لە ڕەشێتی خۆیان نەکەن، بەڵکو هەتا شانازیشی پێوە بکەن، ماڵکۆڵم ڕەشەکانی فێرکرد کەئیتر لە "خوارەوە" تەماشای سپیپێستەکان نەکەن‌و خۆیان بەکەمتر لەوان نەزانن، ڕەشەکان دەتوانن کاری مەزن بکەن، خۆشی نموونەیەکی گەورەی زیندوو بوو.

مێشك سڕینەوە هەروا کاری لەو ڕەشانە دەکرد کە خۆیان بە ئەندامانی "چینە بەرزەکان" دەزانی.. با ماڵکۆڵم باسیان بکات:

ڕەشەکانی بەرزایی "ڕۆکزبێری" -لە (بۆستن) لەباکووری ئەمریکادا- بەلووت بەرزییەوە تەماشای ڕەشەکانی "گیتۆ"[°] یان دەکرد، ئەمانە لە "سەرکەوتووان"ی لانسینگ خراپتر مێشکیان سڕاوەتەوە

"ئەم نەگبەتانە بەهەموو توانایەکیانەوە هەوڵیان دەدا لاسایی سپییەکان بکەن، وا دەزانن ئەگەر "سپی تر" بن "باشتر" دەبن"

ماڵکۆڵم بەشێوە گاڵتەجارییەکەی خۆی باسی پیشەکانی ڕەشەکانی بەرزاییەکە دەکات:

"لەو بڕوایەدام کە لە دە کەسی بەرزایی ڕۆکزبێری هەشتیان بەکاری خزمەت هەڵدەستن بەڵام لەژێر ئەو ڕستەیە دەیشارنەوە:

لەبانکدا کار دەکات،

لەکۆمپانیایەکی تەئمینە...

یان خۆیان بە گەورە دەزانن:

"من لەبنەماڵەیەکی کۆن بوومەتەوە".. ئەمەیە ڕستە شۆڕشگێڕەی کە تەرخان کرابوو بۆ داپۆشینی کاری ئافرەتی خزمەتکار یان چێشلێنەری لای سپییەکان.

دەردی خۆ بەکەم زانینی ڕەشەکان گەیشتبووە ئاستی ڕۆشنبیران، بەڵام کارەساتەکە گەورەتر بوو: دەردەکە گەیشتبووە "پێشەوایان"، ئەمانە خۆیان کردبووە پێشەوایانی ڕەشەکان بەڵام لە ڕاستیدا کارەکەیان زیاتر نۆکەرایەتی بۆ سپییەکان بوو.. ئەمانەن "کوڕەکانی مام تۆم"[٦]"

[°] گیتۆ: ئەو گەڕەکەیە کە کەمایەتییەکی ئاینی یان نەتەوەیی ناچار دەبێت تیایدا بژی.

ئـەم پێشـەوایانە بـۆ ڕازی کردنـی خاوەنـە سـپییەکانیان هێرشـیان دەبـردە سـەر موسـڵمانە ڕەشـەکان [7] خاوەنەکانیان پێویستیان نەبوو بەوەی فەرمانیان پێ بدەن:

".. ئەمانە وەکو بووکەشووشەی سەر شانۆن، باش ڕاهێنانیان پێ کـراوە، تەلـەفزیۆنیان بینیوەو ڕۆژنامەیان خوێندۆتەوە، کەواتا زۆر باش دەزانن پێویستە چی بکەن".

" ناو ناڵێم بەڵام لیسـتەکە بنووسـن بـەناوی گرنگـترین "پێشـەوا"ی ڕەشپێسـت یـان ئەوانەی خۆیان بەپێشەوا دەزانن ساڵی ١٩٦٠ ، ئەو کاتە ناوی ئەو کەسانە دەبـەن کـە هێرشیان دەبردینە سەر، ئێمەی "قولـە ڕەشـەکانی کێڵگـەکان"[8]، ئێمـە کـە ئـەوەندە "شێت" بووین قامچیمان دا لە "خاوەنە باشەکە"مان، یەکەمین شـتی گرنـگ لایـان ئەوەیە بە "خاوەنە باشەکە" بڵێن سـەغڵەت نـەبێ‌و گـوێ نەداتـە "قولـە ڕەشـەکانی کێڵگەکان"و "قولە ڕەشەکانی گیتۆ".

"ئەم موسڵمانە ڕەشانە قەد نوێنەری هەموو ڕەشەکان نین"

یان:

"ئەم ڕق پەرستنە کاری کەسانێکی لێپرسراو نییە"

(..) ئەم پێشەوایانە خەریك بوو بکەونە ژێر پێی یەکترەوە کاتێك پاڵەپەستۆیان دەکرد تـا هەریەکەیان یەکەم کەس بێت بڵێ ئـەم کـارە "قسـەی بـێ سـەرو بـن‌و سـەیری ڕێبـازی ئیسلامیی مۆدێرنە" یان "قسەی نا ئاینیی دژ بە مەسیحییەکانە.

موسڵمانان دەیانوت:

".. ئەم سواڵکەرانە لەپێناوی زەردەخەنەیەکی سـپی یـان دەسـت هێنـانێك بەسەرشـاندا پێڵاوی سپییەکان دەلێسنەوە "[9]

* * * * *

**ئایا بارودۆخی ژیانی ڕەشەکان باشتر بووە؟**

دەسەڵاتدارانی ئەمریکا زانییان کە یەکێکی وەکو ماڵکۆڵم ئێکس دەتوانێ چ سەریەشەیەك بۆ ڕژێم دروست بکات، بەڵام ئایا ئەم دەسەڵاتدارانە سوودیان لەدەرسەکەی ماڵکۆڵم ئێکس وەرگرت؟ سوودیشی لێ وەربگرن بێ

[6] "کوخەکەی مام تۆم" ڕۆمانی خاتوو "هاریێت بیچەر ستۆو"ە، ڕۆمانەکە سۆزی نووسەر بەرامبەر ڕەشەکان پیشان دەدات بەڵام "مام تۆم" هێشتا خزمەتکارە.

[7] موسڵمانەکان ئەم ناوەیان پێ ناخۆش بوو Black Muslims، ماڵکۆڵم دوو ساڵ هەوڵی دا بەم ناوە بانگ نەکرێن بەڵام بێ سوود بوو.

[8] واتا ئەو کۆیلە ڕەشانەی کە کاتی خۆی لەکێڵگەکانی سپییەکان کاریان دەکرد.

[9] ئێریك لنکۆلن، المسلمون الزنوج.. ل١٠٩.

کەڵکە چونکە دەردی ڕەگەزپەرستیی ئەمەریکا بەرهەمی کۆمەڵگەکە خۆیەتی، تاکو کۆمەڵگەکەش وابێ هەزارو یەك دەردی لێ دەبێتەوە.

ڕەشەکان سەلماندیان کە دەتوانن ڕاپەڕن.. پێش کوشتنی ماڵکۆڵم بە ساڵێك–کاتێك لە دەرەوەی ئەمریکادا بوو– "هاوینی دوورو درێژی سووتێنەر" بەپابوو..ڕاپەڕینی ڕەشەکان ڕوویدا.

سێ ساڵ تێپەڕی نەکردبوو بەسەر کوشتنی ماڵکۆڵم دا کاتێك ڕاپەڕینی تر بەرپابوو، ڕاپەڕینەکە گەشتە "واشنتن"ی پایتەخت.. ڕاپەڕینی جەماوەر تێکەڵی فیشەکی قەنناسە ڕەشەکان بوو.

کەمێك بەر لەوەی ئەم نامیلکەیەمان دەربچێت ڕاپەڕینی "لۆس ئەنجلس" –ئایاری ١٩٩٢– ڕوویدا. "ئاغا سپییە پیاوچاکەکە" بۆ سەرکوتکردنی گێرە شێوێنەکان و "قولە ڕەشەکانی گێتۆ" کەوتە جووڵە، سەرۆك (جۆرج بۆش) –پاڵەوانە جیهانییەکەی مافی مرۆڤ!– سوپای دابەزاند بۆ ڕاپەڕیوەکان.

هۆی ڕاستەوخۆی ڕاپەڕینەکە ئەوەبوو کۆمەڵێك پۆلیس وێنەیان گیرابوو کاتێك کەلە ڕەشێك دەدا، بەڵام دادگا پۆلیسەکانی تاوانبار نەکردو بڕیاری دادگا لەڕاستیدا تەنها فوویەك بوو کرا بە ئاگری هەڵگیرساوی ساڵەهای ساڵی ئەمریکا، ئەنجامی ڕاپەڕینەکە کوژرانی پەنجا کەس‌و وێرانیی نزیکەی دە هەزار بینا [10].باشە ئەی ئەگەر ڕاپەڕینێکی گەورەترو توندوتیژتر ڕوووبدات وەزعی ئەمریکا دەگات بەچی؟

کاتێك ماڵکۆڵم لە (نایجیریا)دا بوو فەرمانبەرێکی ئەوێ پێی وت کەوا وەکالەتی موخابەراتی مەرکەزی ئەمریکا C.I.A زیرەکانە هەوڵ دەدات ئەوە لەئەفەریقادا بڵاوبکاتەوە کە باری ژیانی ڕەشەکانی ئەمریکا باش بووەو کێشەی ڕەگەزپەرستی بەرەو چارەسەرکردن دەچێ.. تا ئەمڕۆ ئەم درۆیە هەر دەکەن.. هەمووشی بۆ خەڵەتاندنی گەلانی جیهان بە "بەهابەرزەکانی"ی ئەمریکا.. ماڵکۆڵم زوو وتبووی:

> "چۆن دەتانەوێ حکوومەتی ئەمریکا "دیموکراسی"و"برایەتی" بەگەلە ڕەنگدارەکان بفرۆشێ، ئەوانەی هەموو ڕۆژێك شت دەخوێنن‌و دەبیستن لەبارەی ئەوەی لێرەدا "لەئەمریکا" ڕوو دەدات؟"
>
> "کەواتە کێ لای سەیر دەبێ ئەگەر ئاگر بەردرێتە ئۆتۆمبێلی سەر بە سەفارەتەکانی ئەمریکاو، ئەم سەفارەتانە بەرد باران بکرێن‌و هاوار لە فەرمانبەرەکانی بکرێ "بگەڕێرەوە وڵاتەکەت ئەی پیاوی سپییێست"و هێرش ببرێتە سەر دەزگا مەسیحییەکانی بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت‌و ئاڵای ئەمرێکی لەهەموو جیهاندا بدڕێنرێ؟"

[10]Catherine David, TéléObs, 141,p.3.

## نەتەوەی ئیسلام[11]

کاتێك والاس فارد W.Fard دامەزرێنەری (نەتەوەی ئیسلام)ی ئەمریکا، لەساڵی ١٩٣٠دا پەیدا بوو: دوو بزووتنەوەی ڕەشەکان هەرەسیان هێنابوو، یەکەمیان بزووتنەوەیەکی بەناو موسڵمان بوو ئەویش بزووتنەوەی مۆری (مەغریبی) کۆمەڵایەتی کە ئاغا زادە دروو عەلی Drew Ali پێشەوای بوو، (دروو عەلی) بەتۆمەتی کوشتن گیراو دوای بەرەڵاکردنی بەشێوەیەکی نەزانراو مرد.

بزووتنەوەی دووەم بەربڵاوتربوو، ئەویش هی ڕەشی ناموسڵمان مارکۆس گارڤی M..Garvey بوو کەدروشمی "گەڕانەوە بۆ ئەفەریقا"ی بەرزکردبۆوەو دوای دوورخستنەوەی گارڤیش بزووتنەوەکەی لاواز بوو.

ئەوکاتە ڕێکخراوی تر هەبوون بەڵام بەتەنها (فارد) توانی شوێنکەوتووانی دوو ڕێکخراوەکەی (دروو عەلی)و(گارڤی) بۆلای خۆی ڕابکێشێ.

(فارد) خۆی بەپێغەمبەر دەزانی بەڵام پاش دیارنەمانی، ئێلیجا محمد Elija (کە کردبوویە پێشەوای دوای خۆی) ئەمی کردە خودا. بەپێی ئێلیجا، خودا لە (فارد)دا بەرجەستە ببوو، ئەم خودایەش (ئێلیجا)ی وەك پێغەمبەرێك بۆ ڕەشەکانی ئەمریکا ناردووە، لەدواییشدا خودا دێتەوە سەر زەوی بۆ پێشەوایەتی کردنی موسڵمانە ڕەشەکان، لەڕاستیشدا دیارنەمانی (فارد) یارمەتی (ئێلیجا)ی دا بۆ ڕێکخستنی ئەم ئەفسانەیە هەرچەندە وتراوە کە (فارد) لەبەندیخانەدا مردبوو.

ئەم باوەڕە هەروەها ڕق هەڵگرتن لەمرۆڤی سپی دوو خاڵی سەرەکیی ڕەخنەکانی موسڵمانە ڕاستەقینەکان بوون. بۆ خاڵی دووەم (ئێلیجا محمد) دەیوت کەوا ئیسلامی ڕاستەقینەو پاكو دوور لە کینە بەکەڵکی ڕەشەکانی ئەمریکا نایەت[12] بەڵام دوایی دەبینین مالکۆلم ئێکس دێتە سەر ئەو بڕوایەی ئەم ئیسلامە پاکە ڕزگارکەرەوەی نەك هەر ڕەشەکانە بەڵکو هەموو ئەمریکا.

ڕقی موسڵمانە ڕەشەکان لەمرۆڤی سپی تەنها کاردانەوەی ڕەگەزپەرستییەکەی سپیپێستیان نەبوو بەڵکو هەروا شێوە خۆپاراستنێکە لەو بێ کەرامەتییەی زۆر ڕەش تێی کەوتبوون. ئەمانە بۆ تێکەڵ بوون بە سپییەکانو بەهۆی لاسایی کردنیان وایان لە سپییەکان کردبوو بەکەمیان بزانن‌و لە جاران زیاتر حەز بەتێکەڵ بوونیان نەکەن، مالکۆلم‌و (نەتەوە) تێکەڵخوازەکانیان بەهیچ دەزانی.

هەرچەندە ڕەشەکان لە ئیسلامی ڕاستەقینە لایاندابوو، بەڵام شتی زۆری تریان لە موسڵمانان دەچوو: پێنج نوێژی ڕۆژانەو حەجکردن‌و بەگوناه زانینی خواردنەوەو زیناو خواردنی گۆشتی بەراز، ئافرەتانیشیان جل‌و بەرگی ئیسلامی، لەچك و کراسی درێژیان دەپۆشی.

---

[11] بۆ ئەم بەشە بەزۆری پشتمان بەستووە بە کتێبی "ئێریك لنکۆڵن"ی ڕەشپێست: موسڵمانە ڕەشەکانی لە ئەمریکادا کە لە "١٩٥٩"دا نامەیەکی دکتۆرا بوو و کرایە کتێب.. بڕوانە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی: المسلمون الزنوج في أمريكا، و. عمر الديراوي، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٦٤، ژمارەی لاپەڕەکانی پەراوێزەکانی ئەم بەشەش هی ئەم کتێبەن.

[12] ل٢٧٦-٢٧٧.

ڕەخنەیەكی تر ئەوە بوو نەتەوە (تەورات)ی بەكار دەهێنا بەپاڵ قورئان، ئەوانیش دەیانوت كەوا ئەمە تا ئەو كاتەیە قورئان بەتەواوەتی دەخوێنن و لێی تێ دەگەن[١٣].

بەهەرحاڵ موسڵمانان دوای مردنی ئێلیجا (ساڵی ١٩٧٥) بەو گۆڕانكارییانەی ماڵكۆلم قایل بوون ئەویش بەهۆی (والاس محمد) -كوڕی ئێلیجا– كەچووە جێگەی جێگەی باوكی[١٤]. پەیوەندی والاس بەماڵكۆلمەوە باش بوو هەتا ئەو كاتەش كە نێوان ماڵكۆلم و ئێلیجا تێك چوو بوو و ماڵكۆلم لەڕێكخراوی (نەتەوەی ئیسلام) دوورخرابووەوە.

"فڕێدانی ناوی كۆیلێتی" تایبەتییەكەی تری (نەتەوە) بوو. پیاوی سپی كە ڕەشەكانی فڕاند ئەوانی جیاكردەوە لەخێڵە ئەفریقییەكەیان بۆیە مرۆڤی ڕەشپێست خێڵە كۆنەكەی خۆی نەدەناسی و ناوی باپیرانی نەدەزانی. پیاوی سپیش ناوێكی مەسیحی دایە كۆیلە ڕەشەكان كەناوی كۆیلێتییە، تا ئەو كاتەش كە خودا "دەگەڕێتەوە" بۆ لای گەلە ڕەشەكەی و ناوی نوێیان دەداتێ، مرۆڤی موسڵمان ناوی كۆیلێتی فڕێ دەداو هێمای ئێكس (X) زیاد دەكات بۆ ناوی یەكەمی، بۆیە (ماڵكۆلم لیتڵ) بووە ماڵكۆلم ئێكس، بەهەمان جۆر موسڵمانان ناوی باپیرانیان فڕێداو بوونە: بنجامین ئێكس، لویس ئێكس، جەیمس ئێكس.. ئافرەتانی نەتەوەش: بیتی ئێكس، تێڵما ئێكس..

X دوو واتای هەیە: یەكەم: "نەزانراوی": چەندو چۆنی مرۆڤی موسڵمان ئێستا نەزانراوەو لە دواڕۆژدا دەردەكەون. دووەمیش: نەخێر: مرۆڤی موسڵمان ئێستا دەڵێ نەخێر بۆ ناوی كۆیلێتی[١٥].

موسڵمانە ڕەشەكان خۆیان بەئەندامی خێڵی شاباز Shabazz دەزانن كە "لەبیابانەكانی ئەمریكای باكووردا دۆزراوەتەوە"، ئەم بڕوایەش لێكجیابوونی ڕەشەكان لەكۆمەڵگای ئەمەریكایی پتەوتر دەكات.

لەمانەوە ڕادەی ڕقی موسڵمانە ڕەشەكان دەزانین، ڕق لەهەر شتێك كە بۆنی پیاوی سپی پێوە بێت، ئەو ڕقەی كە ببووە سووتەمەنی بۆ هێرشەكانی ماڵكۆلم دژی كۆمەڵگەی ئەمەریكی، ئەو كۆمەڵگەیەی كە تەنانەت زۆر لە سپییەكانیش بەدەستییەوە دەناڵێنن.

ئەندامانی "نەتەوەی ئیسلام" بەزۆری لاو بوون، پێشەوایانیشیان هەر لاو بوون، بچووكترینیان (٢٣) ساڵ بوو[١٦]. باوكێك وەڵامی قەشەیەكی دابوو سەبارەت بە موسڵمانبوونی كوڕەكەی:

"نەمتوانی ڕێگەی لێ بگرم، لاوە ڕەشەكانمان بەدوای شتێكدا دەگەڕێن كە دەمێكە بە دەستیان نەكەوتووە لەم بزووتنەوە نوێیەدا دۆزییانەوە"[١٧]

هەزاران زۆرترین و دڵگەرمترین ئەندامانی بزووتنەوە ئیسلامییەكە بوون، هەروەها ژمارەیەك هونەرمەندیان لەناودا هەبوو.. دوایی ماڵكۆلم دەبێتە خۆشەویستی هەزاران و هونەرمەندان.

---

[١٣] ل١٩.

[١٤] پێشەوای ئێستای نەتەوەی ئیسلام، لویس فاراخان وەكو ئێلیجا بۆچوونی سەیری هەیە.

[١٥] بڕوانە ل١٣٤–١٣٥.

[١٦] ل٣٣ ئەمەش كاتی كتێبەكەی لینكۆڵن.

[١٧] ل٣٦–٣٧.

بەشی گەورەی ئەندامانی (نەتەوە) دەرچووی بەندیخانەو کۆنە تلیاکخۆرو دزو گەوادو ئافرەتی لەشفرۆش بوون، کەنیسەی مەسیحی ئەمانەی وەرنەدەگرت تا خۆیان پاك نەکرادیەتەوە لەکاتێکدا موسڵمان وەریاندەگرتن و ئەم کەسانەیان پاك دەکردەوەو پەروەردەیان دەکردنەوە[18].

ئەوانەی بەدوای بنەمای ڕەوشتی دەگەڕان دەچوونە ناو بزووتنەوەکە، ئەمانە برایەتیی ڕاستەقینەی نێوان ئەندامانی بزووتنەوەکەیان دەبینی لەکاتێکدا بزوتنەوە ڕەشەکانی تر ناچاری فرت و فێڵ دەبوون بۆ سەلماندنی یەککگرتنی ئەندامانی خۆیان[19]

بەشایەتی پێشەوایەکی ڕەشی موسڵمانیش:

"کۆمەڵەیەك نەبووە ئەوەندەی موسڵمانە ڕەشەکان خاوەنی ئاستی ڕەوشتی بەرز بن، بۆیە توانیان بەسەر خراپەی زۆردا زاڵ بن و خۆشەویستیان لەنێوان ڕەشەکاندا چاند "[20]

هەروەها لاوی ڕەشی زۆر چووبوونە ناو بزووتنەوەکە لەبەر بنەما نوێکانی سەبارەت بەپەیوەندی نێوان پیاوو ئافرەت کە لە ناو بزووتنەوەکەدا هەبووە. بزووتنەوەکە بڕوای بەیەکسانیی نێوان پیاوو ئافرەت هەبوو، ئەوەندە هەیە کار لەنێوانیاندا دابەش کراوە[21].

نرخی ئافرەت لای موسڵمانە ڕەشەکان گەورەبوو، گەورەتر لەنرخی لای ڕەشەکانی ترو لای سپییەکان، ئافرەتەکە بە (خاتوو)و بە(خوشکە) بانگ دەکرا، ئافرەتان بانگەوازیان بۆ ئیسلام دەکرد، ئەوانەش کە کاتی خۆی لەشیان دەفرۆشت یان تلیاکخۆر بوون ئێستا ئافرەتانی تر دەهێننە سەر ڕێگەی ڕاست، هەندێك ئافرەتی موسڵمان بەهۆی موسڵمان بوونیانەوە ژیانێکی تاڵ لەگەڵ کەس و کاریان دەبردە سەر بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر خۆڕاگربوون.

ناودارترین ئافرەتی بزوتنەوە ئیسلامییەکە -کاتی ماڵکۆڵم- (لوثی ئێکس)بوو کە سەرۆکی ڕاهێنانی کچان بوو، (تێڵما ئێکس)و (تاینیتا ئێکس)یش شتیان لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەکەدا دەنووسی[22].

بانگخوازە ئیسلامییەکان بەشایەتیی زۆر کەس هێمن و نەرم و خاوەن بڕوا بەخۆبوون، قسەکانیشیان پڕی بوو لەخۆشەیستنی ڕەشەکان و ڕق لە سپییێستان. هەموو چوارشەممەیەك لاوەکان بەناو بازاڕو باڕو چایخانەو مەلهاکاندا دەگەڕان و بانگەوازیان بۆ بزووتنەوەکە دەکرد، یەك شەممانیش نزیك کەنیسە مەسیحییەکان هاتوچۆیان دەکردو بڵاوکراوەیان دەدایە دەست ئەوانەی دەچوونە ئەوێ[23].

---

[18] ل٤٠.
[19] ل٤٢.
[20] ل١٨٦.
[21] ل٤٣.
[22] ل٢٤٤.
[23] ل١٤١.

ڕێکوپێکیی موسڵمانان هەتا منداڵانیشی گرتبووەوە، منداڵان جلوبەرگ پاك‌و زمان پاك بوون‌و وەکو گەورەکان بە (برا)و (کاکە)و (خاتوو)و (خوشکە) یەکتریان بانگ دەکرد[٢٤].

موسڵمانان قوتابخانەی تایبەتیی خۆیانیان هەبوو، ئەمانە وانەی مێژووی ڕەشەکانیان تێدا دەخوێنرا کە لە هیچ قوتابخانەیەکی تردا نەبوو، ئەو ڕەشانەی منداڵیان نەدەناردە ئەوێ دانیان بەو ڕاستییە دەنا کە قوتابخانەکانی موسڵمانان باشترن.

"منداڵەکانمان گەورە دەبن‌و نازانن خۆیان کێن‌و مێژووەکەیان چییە، هەموو قوتابخانەکانی سپییەکانیش باسی کارە گەورەکانی سپییێستیەکان دەکەن، ئەو سپییانەی هەمیشە لافی دادپەروەری‌و یەکسانی لێ دەدەن"[٢٥]

چەند لایەنێك هەوڵی دا دەست بەسەر (نەتەوە) بگرێ، وەکو حزبی کۆمۆنیستی ئەمریکی (ساڵی ١٩٢٣)، ژاپۆنییەکان‌و ئەسیوبییەکان بەڵام بێ سوودبوو[٢٦]، (فیدل کاسترۆ)ش هەروا سەرکەوتوو نەبوو.[٢٧]

ماسۆنییەت –داردەستی جوولەکە– توانیبووی بچێتە ناو ڕێکخراوە ڕەشەکان، بەوتەی ڕۆژنامەی (لۆس ئەنجلس هێراڵد دیسپاچ) یش کە موسڵمانە ڕەشەکان شتیان تێدا دەنووسی:

جوولەکە ڕەشەکانیان سەرقاڵی "تێکەڵخوازی" دەکرد تا لەکێشە سەرەکییەکەیان دووریان بخەنەوەو وایان لێ بێ کاتی خۆیان بە "مێش گرتن" بەرنە سەر لەکاتێکدا جوولەکە لەسەر حیسابی ئەوان بناغەی ئابوورییەکەی خۆیان پتەوبکەن[٢٨]

ئەگەر جوولەکەیەکیش بیەوێ لەپێشەوایەکی ڕەش ڕزگاری بێ ڕاستەوخۆ هێرشی ناباتە سەر بەڵکو پێشەوایەکی ڕەشی تر بانگ دەکات‌و ڕێگەی پێدەدات تەوقە لەگەڵ ژنە سپییەکەی بکات‌و پێی دەڵێ کە خەڵك هەموویان یەکسانن، ڕەشەکەش دەچێتە دەرەوەو ئامادە دەبێ دایکی خۆی بکوژێ ئەگەر ئەو دایکەی ڕێگەی "تێکەڵبوون" لەگەڵ سپییەکانی لێ بگرێ[٢٩]، لەم کاتەش دا کابرای جوولەکە تەماشای هەردوو ئەو پێشەوایە دەکات کە تێکبەربوون، هەر یەکەش لەوان جوولەکەکە بە هاوڕێی خۆی دەزانێ[٣٠].

---

[٢٤] ل١٧٧.

[٢٥] ل٤٤.

[٢٦] ل٢٥–٢٦.

[٢٧] بڕوانە ل٢٨..

[٢٨] ل١٤٨ وەك چۆن ئێستا دەوڵەتە گەورەکان –نەخشە بۆ جیهان دەکێشن بەڵام وڵات‌و گەلە "دواکەوتووەکان" بەشتی لاوەکی سەرقاڵ دەکەن وەکو لابردنی دیکتاتۆرێك یان دەستکەوتنی ئۆتۆنۆمی– ئەمە تێبینیی ئەو چاپە بوو بەڵام ڕۆژان بۆیان سەلماندم ئەو دەوڵەتانە ئەوەش بە میللەتان ڕەوا نازانن مەگەر تەنها بەرژەوەندییەکیان لەمە هەبێ.

[٢٩] هەمان دەرد لە پەیوەندیی نێوان میللەتێکی بەهێزو پێشکەوتوو و میللەتێکی هەژارو دواکەوتوو. هەمان شت بخەرە پێش چاوت سەبارەت بە کوردێکی خاوەن کەسایەتییەکی ڕوخاو و لاواز کاتێك ئەمەریکییەك بەدەمییەوە پێدەکەنێ‌و لەخۆی نزیکی دەکاتەوە، ئەو کاتە ئەو ناخ ڕووخاوە ئامادەیە خوێنی برا کوردەکەی بڕێژێ ئەگەر ئەو ئەمەریکییە چاوێکی بۆ بتروکێنێ، پاش هەموو

دیارە جوولەکە نەیانتوانی بچنە ناو (نەتەوە) چونکە موسڵمانە ڕەشەکان هێرشی زۆریان دەبردە سەریان و سەر (ئیسرائیل)، (نەتەوە) جوولەکەی بەسپی دەزانی بەڵکو لەوە خراپتر: بەخوێنمژی ڕەشەکانیان دەزانین.

موسڵمانە ڕەشەکان کاری دوژمنانەیان دژی حکومەت نەدەکرد، بەڵام کە تەعدایان لێ بکرایە بێدەنگ نەدەبوون، ڕەخنەشیان لەو "پێشەوا" ڕەشانە دەگرت کە ترسنۆکن، ئەمەش ڕێزی بۆ دروست کردن تەنانەت لای ناموسڵمانەکانیش. موسڵمانەکان دەیانوت:

"ئێمە ڕاستی دەڵێین هەتا ئەگەر بشکوژرێین.. لەکاتێکدا پێشەوا ڕەشەکانی تر مەرایی بۆ پیاوی سپی دەکەن"[31]

موسڵمانەکان ڕەشەکانیان فێردەکرد سەربەخۆیی ئابووری بەدەست بهێنن و چیتر پشت بەسپییەکان نەبەستن، سپییەکانیش لەوە دەترسان موسڵمانان ڕەشەکانی ناو کارگەکان کرێکارە سپییەکان هان بدەن مان بگرن، دیارە سپییەکانیش مل کەچ نابن، ئەو کاتەش هەردوولا دەست دەدەنە کاری توندوتیژی، وەك پۆلیسێکیش دەڵێ:

"ئەگەر ئەمە ڕووبدات دۆزەخ بەسەر تەپڵی سەرماندا دەکەوێتە خوارەوە"[32]

(نەتەوەی ئیسلام) زۆری کرد بۆ ڕەشپێستەکان، مرۆڤێکی ڕەشی نوێی دروستکرد، مرۆڤێکی ڕەشی سەربەرز، ماڵکۆڵم دەیوت:

"ئێوە دەتوانن بەناوماندا بگەڕێن، ڕێزیشتان لێ دەگیرێ زیاتر لەو ڕێزەی پێشەوا ڕەشەکانی تر لێتان دەگرن، ئەوانەی بۆ لەتەنانێك دەستتان ماچ دەکەن، بەڵام ئەی سپیپێستان ئەمە بزانن: ئەو ڕەشپێستەی دەتانناسی مرد"[33]

---

شتێکیش ئەمەریکییەکە هیچ بۆ ئەو کوردە ناکات وەك چۆن لەم ڕۆژەماندا دەیبینین و وەك چۆن ئەزموونی ڕەشەکان فێرمان دەکات.

[30] ل٢٠٨ لەهەمان ڕۆژنامەوە.

[31] ل٢٠١.

[32] ل٣٠.

[33] ٢١٥.

## مردووەیەك[٣٤]

ماڵکۆڵم ساڵی (١٩٢٥) لەدایك بوو، باوکی ماڵکۆڵم کابرایەکی نەترس بوو، قەشەیەکی شوێنکەوتووی (مارکۆس گارڤی) بوو، لەبەر ئەوەشی باوکی قسەی بۆ ڕەشەکان دەکرد ڕەگەزپەرستانی کیوکلەکس کلان Ku Klux Klan و (تیپی ڕەش) هەڕەشەیان لێ دەکرد تا دوایی بەدەستی تیپی ڕەش کوژرا، ماڵکۆڵم ئەو کاتە شەش ساڵان بوو.

(لوین) دایکی ماڵکۆڵم، توانی کاروباری خێزانەکە بەڕێوەبەرێ، ساڵی (١٩٣٤)یش خێزانەکە برسێتیی بەخۆیەوە دی. پێستی لویز نزیکە سپی بوو -چونکە باوکی سپیپێست بوو- بۆیە دەیتوانی کار لەماڵە سپییەکاندا بدۆزێتەوە بەڵام کاتێك ماڵەکە دەیزانی کە لەئەسڵدا ڕەشە دەری دەکرد، تا دوایی خێزانەکە ناچار بوو لەبرسانا خواردەمەنییەکانی دەوڵەت وەربگرێ. تا ئەو کاتەش لویز بۆ پاراستنی کەرامەتی خۆی لەم جۆرە یارمەتییانە خۆی دوور ڕادەگرت، بێدەرامەتیش وای لێ کرد گیا بکاتە خواردن بۆ منداڵەکانی.

پیاوانی (لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی) بەهۆی ئەو پارەیەی دەیاندایە خێزانەکە خۆیان لەکاروباری هەڵدەقورتان، ژیانی لویزیان کردبووە دۆزەخ. ئەو دەیویست دەریان بکات بەڵام لەبەر یارمەتییەکە نەیدەتوانی.

لەکۆتاییدا ئەو پیاوانە توانیان ماڵکۆڵم لەدایکی بسێنن و بیدەنە خێزانێکی تر بۆ بەخێوکردنی ئەویش چونکە ماڵکۆڵم بۆ خۆتێرکردن وردە دزیی دەکردو بەم جۆرە ئەوەی سەلماند کە دایکی ناتوانێ پەروەردەی بکات. ئەمان پاش ئەوە توانییان هەموو کورو کچەکانی لێ بسەنن و بەم جۆرە لویز تێکچوو و خرایە نەخۆشخانەی دەروونی، ماڵکۆڵمیش ئەوان تاوانبار دەکات و ئەوان دەکاتە هۆی هەڵوەشانی خێزانەکەی و دەڵێ کە تەنها خێزانەکەی خۆی ئەمەی بەسەردا نەهاتبوو.

ماڵکۆڵم هاروهاج بوو بۆیە لەسیانزە ساڵیدا خرایە بنکەیەکی (دەست بەسەردا گرتن) لای ئافرەت و پیاوێکی سپیپێست بۆ ئەوەی دوایی بنێردرێتە بنکەیەکی چاککردن بەڵام ئەم دوانە توانیان ناردنی دوا بخەن و کارێکی بۆ بدۆزنەوە.

ماڵکۆڵم باشووری ئەمریکای جێهێشت و چووە لای (ئێلّلا)ی خوشکی، خوشکی لەباوکییەوە، لەشاری (بۆستن) لەباکووردا، ئێلّلا نێرە ئافرەتێك بوو کە لەبەرزایی (ڕۆکزبێری)دا دەژیا لە کاتێکدا (ماری) –خوشکەکەی تری ماڵکۆڵم– لەگیتۆی ڕەشەکان دابوو. ماڵکۆڵم زیاتر حەزی لە گیتۆ بوو چونکە "شەیدای.. چێشتخانە هەرزانەکان و بارو هۆڵەکانی بلیارد.. بووم".

---

[٣٤] لێرەوە وەك وتم سوودی گەورەم ە یادداشتەکانی ماڵکۆڵم وەرگرتووە کە ڕۆژنامەنووسی ڕەشپێست (ئەلێکس هالی) بۆی تۆماردەکرد. ماڵکۆڵم باوەڕی بە هالی نەبوو، وایدەزانی موخابەرات لەستۆدیۆکەدا قسەکانی تۆمار دەکەن بۆیە تا چەند هەفتەیەك بەم قسەیە دەستی پێ کرد: "هەلەو، هەلەو، لەسەر خەتن؟ باشە، ئەمەیە ماڵکۆڵم ئێکس". هالی چەند ساڵێك دوای کوشتنی ماڵکۆڵم ڕۆمانە ناودارەکەی نووسی (ڕەگەکان) کە دەربارەی ڕەشە فڕێندراوەکانی ئەفەریقایە. هالی پێش چەند مانگێك (قسەی نەوەدەکانمانە) بە موسڵمانێتی کۆچی دوایی کرد.

لەوێدا هاوڕێی ڕەشێك بوو کەناوی دەنێ (کورتە باڵا) ئەویش کارێکی بۆ دۆزییەوە: پێڵاو بۆیاغکردن لەهۆڵێکی سەما لەشارەکەدا. ماڵکۆڵم دەڵێ پێڵاوی مۆسیقاژەنە بەناوبانگەکانی بۆیاغ کردووە "تا ئێستاش جۆنی هۆجز ١٥ سەنت قەرزاری پێڵاو بۆیاغ کردنێکمە"!!

ماڵکۆڵم زانی کەوا ئەو پارەیەی لە فرۆشتنی تلیاکی (ماریجوانا)و مەشروب و گەوادی دەستی دەکەوێ زۆر زۆرترە لەوەی لەپێڵاو بۆیاغکردن بۆی پەیدا دەکرێ.

(کورتە باڵا) فێریشی کرد چۆن قژە لوولەکەی زەردو خاو بکات واتە چۆن ببێتە "کۆنك"ێکی مێشکسڕاو. پاشان فێری سەما بوو و بووە سەماکەرێکی لێهاتووی وا کە کچان بۆ سەماکردن داوایان دەکرد. وەك بە ئێڵلای خوشکیشی وت: نەیدەتوانی لەیەك کاتدا کار بکات و سەما بکات بۆیە وازی لە پێڵاو بۆیاغکردن هێنا. لەو ماوەیەشدا ئافرەتێکی سپیپێستی جوانی مێردداری ناسی کەناوێکی خوازراوی (سۆفیا)ی لێ دەنێ. سۆفیا مەسرەفی دەکردو دوایی کارێکی بۆ دۆزییەوە. ئەو کاتە ماڵکۆڵم (١٦")ساڵ بوو "بەڵام بەلەش و باڵای (٢٦) ساڵان".

ماڵکۆڵم دوایی چووە هارلم "گەڕەکە گەورە بەناوبانگەکەی ڕەشەکان لەشاری نیویۆرکدا"و لە بینایەکدا دەنوست کەبە زۆری ئافرەتی ڕەشی لەشفرۆش تێیدا دەژیان. ماڵکۆڵم بۆمان باس دەکات چۆن پیاوی سپی دەهاتن بۆ هارلم بۆ دەستکەوتنی ئافرەتی ڕەش و چۆن ئافرەتی سپی دەهاتن بۆ ڕابواردن لەگەڵ پیاوی ڕەش. ئەم شتانە ڕۆژانەو ئاسایی بوون بەڵام لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا ڕاپەڕین و تاڵانی لەهارلمدا ڕووی دا، لەوکاتەشەوە سپییەکان دەترسان بچنە ئەوێ.

ماوەیەك خەریکی قاچاخچێتی (ماریجوانا)و شتی تر بوو، دوایی وردە دزیی دەکرد، کە لێپرسراوانیش دژ بەم کارانە توندو تۆڵتر بوون دەستی دایە قاچاخچێتیی ژمارەکانی بلیتی (یانەسیب)، ئەویش بۆ کابرایەکی سپیپێست.. سپییەکان "ڕێکخەری قاچاخچێتی بوون لەهەموو شوێنێکدا".

پاشان بووە گەواد لای ئافرەتێك.. پیاوی سپیپێستی دەهێنا بۆلای ئافرەتی ڕەشپێست، هەروەها گەوادیشی دەکرد بۆ ئافرەتێکی سپیپێست کە پسپۆڕی کاری گەوادی بوو.

وازی لەم کارە هێناو لای جوولەکەیەك ئیشی کرد کە یەکێك لە ئیشەکانی قاچاخچێتیی مەشرووب بوو –ئەو کاتەش دروستکردن و فرۆشتنی مەشرووب لە ئەمەریکادا قەدەغە کرابوو. ئەم جوولەکەیە نەك تەنها قاچاخچی بوو بەڵکو هەروەها فێڵیشی لەمەشرووبەکان دەکرد.

ماڵکۆڵم پەروەردەی گۆم و زەلکاو بوو، شایەتی ئەو پێش هەموو شایەتییەك وەردەگیرێ.. ماڵکۆڵم شایەتی ژیانی نزمی گەورە پیاوانی ئەمریکا بوو.

ژنی ئەو کابرایەی ماڵکۆڵم قاچاخچێتیی ژمارەی یانەسیبی بۆ دەکرد بۆی دەگێڕایەوە چۆن بەرتیل دەدرێتە فەرمانبەران و چۆن پیاوانی ئاسایش بەکرێ دەگیرێن و چۆن پارێزەر هەن بێ بروانامە کاردەکەن.. گەندەڵییەك بوو لەسەر بەرزترین ئاستی پیاوانی دەوڵەت. ئافرەتەکە پێشی وت کەوا (تاوانبار)و (پیاوی یاسا)و (پیاوی

سیاسی) شەریکن و لەهەر دەزگایەکی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابووریی ئەمریکا ناتوانرێ یەکێکیان لەوانەی تر جیابکرێتەوە.

(شذوذ)ی جنسیی ئەمەریکییەکان بەزۆری لەناو چینە بەرزەکانداو نێوان پیاوانی "بەرز"دا دەبینرا[٣٥].

(ڕۆدی) کە هاوڕێیەکی ماڵکۆڵم بوو لای یەکێك لە کۆڵەکەکانی کۆمەڵگەی (بۆستن)دا کاری دەکرد، ئەم کابرایە پیرەمێردێك بوو ئارەزووی ئەوەی هەبوو ڕۆدیی خزمەتکاری جلەکانی بۆ لەبەردابکەنێ و (پۆدرە) لە هەموو لەشی بدات.

کاتێکیش ماڵکۆڵم خەریکی گەوادی بوو دەیبینی ئەوانەی بە دزییەوە دەهاتنە (هارلم) بۆ کاری جنسی، ئەمانە پیاوانی سیاسەت و پیشەسازی و دارایی و خاوەن دەسەلات بوون، هەروەها سەرۆکەکانی شارەوانی و ناودارانی سینەماو شانۆ، ئەمانە کە دەگەیشتنە جێگەی مەبەست دەموچاوە دەستکردە بەشەرەفەکانیان دەکەوتە خوارەوە، ئەمانە "پارەیەکی زۆریان سەرف دەکرد بۆ خۆشییە سەیرەکانیان کە دوو یان سێ یان چوار سەعاتیان دەخایەند".

هەندێکیان داوایان دەکرد بەقامچی لێیان بدرێ، سەیریش ئەوەیە کە بەساڵاچووەکان (٦٠ یان ٧٠ ساڵ) داوای ئەمەیان دەکرد، هەندێکیشیان پارەیان دەدایە ماڵکۆڵم بۆ ئەوەی تەماشایان بکات کاتی لێدانەکە. ئەمانە دەکەوتنە سەر ئەژنۆو لەئافرەتە ڕەشەکان دەپاڕانەوە ئەویش لێی دەدان. ئافرەتەکە "وەکو خەڵووز وابوو"، ئەم سپیانە دەیان وت "چەند ڕەش تر ببێت ئەوەندە باشترە"، بە پێچەوانەی ئەوەی لەدەرەوەی ئەو جیهانەی هارلمدا دەوترا.

هەندێك (مەعمیل) ئافرەتی سپیپێست بوون، ئافرەتە گەوادەکە پیاوێکی ڕەش.. "زۆر ڕەش"ی دەناردە ماڵی ئەو ئافرەتە سپیپێستانە، ئەو ماڵانەی کە -کاتێك پێوەندی نێوان ڕەش و سپی بە ئاشکرایی بێ- دەرگا ناکەنەوە بۆ مرۆڤی ڕەش تەنها مەگەر خزمەتکار بێت.

ئا لێرەدا لە جیهانی پشتەوە، جیهان ئارەزووی سەیرو نەخۆشی، هەموو شتەکان ئاوەژوون.

ماڵکۆڵم تووشی بەزمێك لەگەڵ قاچاخچییەکی تر بوو و خەریك بوو حاڵ بگاتە کوشتن، ئا لەم کاتەدا (کورتە باڵا) لە (بۆستن)ەوە هات و ماڵکۆڵمی بردە ئەوێ و تاقمێکیان بۆ کاری دزی پێکهێنا، ئەو دوانە و ڕۆدی لەگەڵ (سۆفیا) و خوشکەکەی. کاری ئەم دوو ئافرەتە سپییەش ئەوە بوو بەناوی لێکۆڵینەوە یان شت فرۆشتن.. ئەو ماڵە بپشکنن کە دەچنە ناوی و دوایی نەخشەیەکی دروست بکەن، پیاوەکانیش بەهۆی ئەم زانیارییانەوە دەچنە سەر ئەو ماڵە، یەکەم ماڵیش چوونە سەری ماڵی ئەو پیرە سەیرەی (ڕۆدی) کاری لا دەکرد، شتە دزراوەکانیان دەدایە کابرایەکی سپی کە دەیخستە گەراجەکەی خۆی، ئەم کابرایە لەوان دزتر بوو چونکە لەوان زیاتری دەست دەکەوت.

---

[٣٥] (شذوذ) ئێستا بۆتە ئاسایی و تەنانەت لە ژمارەیەك شوێنی ئەمەریکادا بۆتە یاسایی تەنانەت ناوی (شذوذ)ی لێ نانرێ هەرچەندە بەرەنگارییەکی توندیش لەدژی بەیاسایی کردنی لە ئەمەریکادا هەیە ئەویش بەهۆی ئەوەی ڕەوتی موحافز تێیدا بەهێزەو پشتیوانییەکی هەیە لەناو بەشێکی گەورەی جەماوەردا.

ماڵكۆڵم وەكو جاران تلیاكی زۆر خواردبوو، ناوریایانە ڕەفتاری كردو لەمەلهایەكدا بووە هۆی ئەوەی هاورێیەكی مێردی (سۆفیا) بەو پێوەندییەی نێوانیان بزانێ. لەوكاتەشەدا مێردی سۆفیا بەچەكەوە هاتە ماڵی ماڵكۆڵم -بنكەی دزیكردن– بۆ كوشتنی.. ئەو لای سەعاتچییەكی جوولەكە بوو بۆ ئەوەی سەعاتێكی دزراوی وەربگرێتەوە كەپێشتر بۆ چاككردن دابنابوو، جوولەكەكە سەعاتەكەی ناسیبوووەوەو خەبەری دابوو. كابرای ئاسایش ماڵكۆڵمی گرت بەڵام نەیپشكنی، ماڵكۆڵم چەكدار بوو و دەیتوانی ئاسایشەكە بكوژێ بەڵام لەپڕ دەمانچەكەی دەركردو دایە دەستی.. دوایی زانی كە دوو ئاسایشی تر خۆیان شاردبووەوە، ئەگەر تەقەی بكردایە دەیانكوشت.. خودا لەو ڕۆژەدا دوو جار ژیانی پاراست.

خودا ویستی ماڵكۆڵم بژی بۆ ئەوەی كارێكی گەورە بەجێ بهێنێ.

" وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ"–یوسف:٢١"

تاوانەكەی ماڵكۆڵم دوو سێ ساڵی سزای بەس بوو بەڵام حوكمەكەی دە ساڵ بوو چونكە ماڵكۆڵمو (كورتە باڵا) "قولە ڕەش" بوونو هاورێیەتی ئافرەتی سپییان دەكرد:

"چ كچێكی سپی باشنو چ قوڵە ڕەشێكی پیسن"!

ماڵكۆڵم (٢١) ساڵی تەواو كردبوو كاتێك خرایە بەندیخانە.

ماڵكۆڵم باسی ڕۆژانی گومرایی و ژیانی ناو گۆمی تاریكی دەكات:

"بەدرێژایی ئەو تەمەنە مردبووم.. مردبووم لەناوەوە"..

ئەو كاتە ئەمەی نەدەزانی. ڕۆژێك -دوای ئەوەی بووە بانگخوازێك بۆ ئیسلام– بانگ كرابوو بۆ سیمینارێك لە كۆلێجی یاسا لەزانكۆی (هارڤارد)دا، بەڕۆشتنەوە بوو كاتێك لەپەنجەرەوە تەماشای دەرەوەی دەكرد.. ئەو بینایەی بینی كە كاتی دزیو چوونە سەر ماڵان كردبوویە بنكە:

وەكو شەپۆل هەست لەناخیدا جووڵا، جارانی كەوتەوە یاد كە "وەكو ئاژەڵ دەژیامو بیرم دەكردەوە". ئەوسا لەكوێو چیی دەكردو ئێستا لەكوێیەو چی دەكات.

لەم بیركردنەوانەدا بوو كە چیرۆكێكی یۆنانیی كۆنی بیركەوتەوە.. (ئیكار) لاوێك بوو باوكی باڵی بۆ دروستكردبو و بەمۆم پەرەكانی بەیەكەوە بۆ لكاندبوو. ئیكار دڵی خۆش بوو، وای زانی خۆی بەرزدەكاتەوە تا ئەوەندە بەرزفڕی خۆر مۆمەكەی توانەوەو كەوتە خوارەوە.

"لەبەردەم ئەو پەنجەرەیەدا لە هارڤارددا بڕیارم دا بەرامبەر خودا كە ئەوەم لەیاد نەچێ كە ئیسلام ئەم باڵانەی پێ دام، تەنانەت یەك چركەیەكیش ئەوم لەیاد نەچوو".

## بەندیخانە

ماڵكۆڵم لەبەندیخانەی (چارلستن)دا بەندكرا. بەم جۆرە لەپڕ تلیاكی لێ بڕا. كەوتە كوفر كردن، ئەوەندەش دوژمنایەتیی ئاینی دەكرد بەندكراوەكان ناویان نابوو "شەیتان"، ئەو كاتەش ڕەشپێستێكی ڕۆشنبیر لەگەڵیدا

بەندکرابوو کە بەهۆی ئەوەوە فێربوو کوێرانە هێرش نەباتە سەر ئاین بەڵکو بەڵگە بەکاربهێنێ هەرچەندە وەکو ئەو دەڵێ بەڵگەکانی ئەو هیچ نەبوون لەچاو بەڵگەکانی ئەو هاوڕێ ڕەشپێستەی.

ماڵکۆڵم توانی تلیاك پەیدا بکات ئەویش بەهۆی پاسەوانەکان کە بە بەندکراوەکانیان دەفرۆشت. (ئێڵلا)ی خوشکی پارەی بۆ دەنارد، ئیڵلای یەکەم کەس بێت بۆ بینینی. (فیلبەرت)ی خواناسی برای نامەیەکی بۆ ناردو تیایدا وتبووی کە "کەنیسەکەم دوعات بۆ دەکات" ئەویش وەڵامێکی زۆر خراپی دایەوە.

(هیڵدا)ی خوشکی بۆی نووسی کە ئەو پۆستکارتانەی دەیاننێرێت لەبەر خراپیی ڕێزمان و دەست و خەت ناخوێنرێنەوە.. ماڵکۆڵم دەڵێت لەکۆتایی قوتابخانە سەرەتاییەکەوە لە ماسۆن (مەیسن)دا بە مێشکیدا نەهاتبوو هیچ بخوێنێ "لەوانەیە جگە لە هونەری قاچاخچێتی" بۆیە دەستی کرد بەفێربوونی ئینگلیزی و چاك کردنی دەست و خەتی.

دوای ئەوەی برایە بەندیخانە (کۆنکۆرد) فیلبەرتی برای –کە هەمیشە خەریکی چوونە ناو بزووتنەوە نوێکان بوو– نامەیەکی بۆ نارد کەوا "ئاینی سروشتی ڕەشەکانی دۆزیوەوە"، وەڵامی ئەم جارەی ماڵکۆڵمیش باشتر بوو بەڵام هەر قسەی وت بە "کەنیسە" نوێکەی براکەی. دواییش نامەیەکی بۆ هات لە (ریجیناڵد)ی برای کە تێیدا دەڵێ جگەرە نەکێشێ و گۆشتی بەراز نەخوات و دوایی پێی دەڵێ چۆن لەبەندیخانە دەردەچێ. ماڵکۆڵم وای زانی براکەی پیلانێکی بەدەستەوەیە بۆ دەربازکردنی، بەهەرحاڵ بەقسەی کرد.. گیراوەکانیش سەریان سوڕما بوو: ڕەشپێستەکان شێتی گۆشتی بەرازن کەچی "شەیتانەکە" گۆشتی بەراز ناخوات.

براو خوشکەکانی لە (دیترۆیت)و (شیکاگۆ)دا ببوونە موسڵمان، دوعایان بۆ ماڵکۆڵمی برایان دەکرد بێتە سەر ڕێی ڕاست. (ئێڵلا) –کەهێشتا نەبووە موسڵمان– واسیتەیەکی بۆ کرد بۆ ئەوەی بنێردرێتە موستەعمەرەی (نۆرفۆلك) کەلە بەندیخانە نەدەچوو، کتێبخانەیەکی گەورەی تێدا بووەو دەمەتەقێی فیکری تیادا دەگێڕدراو پسپۆڕ لەزانکۆی (بۆستن)و (هارڤارد)ی بۆ دەهات.

ماڵکۆڵم ساڵی ١٩٤٨ برایە ئەوێ، لەوێدا (ریجیناڵد)ی برای بچووکی هاتە لای و باسی (ئێلیجا)و (فارد)و (شەیتان)ی کرد، شەیتان پیاوی سپییە، ریجناڵد وای پێ ووت. دوای چەند ڕۆژێك هاتەوە لای و باسی شەیتانی سپی بۆ کردەوەو بۆی باس کرد چۆن ئەو شەیتانە مێشکی مرۆڤی ڕەشپێستی سڕیوەتەوە.

قسەکانی دوو سەردانەکە کاریان تێکرد، ئێستا بۆ یەکەمین جارە بیر لەشتی جددی دەکاتەوە. دوابەدوای ئەمە ڕۆژانە نامەی لەبراو خوشکەکانییەوە بۆ دەهات و شتی زیاتری زانی لەبارەی مێژووی مرۆڤی ڕەش و ئەو مێشك سڕینەوەیەی سپییەکان لەگەڵیدا کردوویانە. (هیڵدا)ی خوشکی بۆی گێڕایەوە چۆن پیاوی سپی لەسەر زەوی پەیدا بوو "کە چیرۆکێکی خەیاڵییەو پڕە لەڕق لەو پیاوی سپییە"[٣٦]، ماڵکۆڵم دەڵێ دوای ئەم قسانە :

"وەك چۆن هەموو هەستە ئاژەڵییەکانی گیتۆو دارستان و هەستی ئاژەڵیی ڕێوی و گورگ و تاوانکاری.. بەبادا چووبن".

[٣٦] ئەو چیرۆکە مایەی تووڕە بوونی موسڵمانی ڕۆژهەڵات بوو. بەڵام ماڵکۆڵم لۆمەیان دەکات کە کارێکی وایان نەکردووە ئیسلامی ڕاستەقینە بەڕۆژئاوا بگەیەنرێ و ئەمە ڕێگە خۆش دەکات بۆ چیرۆکی وا..

ئینجا موعاناتی مالکۆڵم دەستی پێکرد، زۆر بەزەحمەت نانی بۆ دەخورا. خەریك بوو لە برسانا بمریّ و هاوڕێیانی بەندیخانەو لێپرسراوان سەغڵەت ببوون "سەخت ترین و جوانترین موعانات بوو کەبەسەرم هات".

نامەیەکی بۆ (ئێلیجا) نووسی ئەویش وەڵامی دایەوە. نۆرەی نوێژکردن هات، ناخۆشترین شت بوو لای چونکە وەك دەڵیّ چۆك دادانی تاوانباران لەسەر دڵ زەحمەتە:

"مـن تەنـها بـۆ چارەسـەرکردنی قفڵێـك کـاتی دزی بەسـەر ئـەژنۆدا چۆکـم دادەدا"

کاتێکیش توانی چۆك بۆ خودا دابدات و ئاوا بمێنێتەوە:

"نەمزانی چی بۆ خودا بڵێم".

خێرا گۆڕانکاریی بەسەردا هات. مالکۆڵم ئاکارێکی هەبوو: هەرکاتێك بڕیاری دەدا زوو دەکەوتە کار. خۆی زۆر سەرقاڵ کردبوو، نامەی زۆر دەنارد بۆ ئێلیجا و خوشك و براکانی و هاوڕێیـانی گومڕایـی بـەڵکو هـەتا بـۆ لێپرسراوانی دەوڵەت و بۆ سەرۆك کۆمار خۆی، تاوانەکانی سپیپێستەکان دەخستە بەردەم ئەم لێپرسراوانە، بیّ گومان هیچ لەم نامانە نەدەخوێنرانەوە –ئەوە ئەگەر گەیشتبێتنە جیّ.

بـۆ چاککردنی دەسـت و خـەتی و زانینـی وشـەی نـویّ فەرهـەنگێکی وەرگـرت و هـەمووی نووسـییەوە، بەفەرهەنگ و نامەکانییەوە "ڕەنگە دوو ملیۆن وشەم نووسیبیّ".

هەروەها سەرقاڵی خوێندنەوە بوو، تا سەعات سیّ یان چواری بەیانی و لەبەر ڕووناکییە کەمەکەی داڵانەکە.

ڕۆژبەڕۆژ هەستی دەکرد حەزکردنی بە هاوڕێتیی سپییەکان زیاتر لە هاوڕێتی کردنی ڕەشـەکان تاوانـە، کـە ئـەو گۆڕانکارییانەشـی بەسـەردا دەهـات پێوەنـدی خـۆی لەگـەڵ ڕەشـەکاندا پتـەوتر دەکـرد. باسـی مێـژووی ڕەشەکانی بۆ ئەو برایانەی باس دەکردو بۆی باس دەکردن چۆن سپییەکان توانییان مێشکیان بسڕنەوە کە گوایە هەرچییەك سپیتر بیّ باشترە، زۆر جار بەشێکیان توند ڕادەچڵەکان دواییش دەکەوتنە بیرکردنەوە.

کە دەیزانی هاوڕێکەی "پیّ گەیشت" بانگی دەکرد بۆ شوێنکەوتنی (ئێلیجا). دەشبوایە وریا بووایە چونکە دەکرا نەگبەتێکی مێشکسڕاو، "مام تۆمێك" خەبەر بداتە سپییەکان.

مـالکۆڵم هـەر خـۆی بانگەوازکـەری نـاو بەندیخانـەکان نـەبوو، لەهـەموو بەندیخانـەکاندا بـانگخواز هـەبوون، ئیسلام لەناویاندا بەخێرایی بڵاودەبووەوە، بەندکراوەکان زیـاتر لەڕەشـەکانی دەرەوەی بەندیخانەکان سروشـتی پیاوی سپییان دەزانی، ئەم بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش ببووە مایەی ناڕەحەتیی حکومەتی ئەمریکا.

بەندیخانە جێگەی کۆکردنەوەی ئەندام بوو.. ڕەشپێستێکی بەندکراو دەڵێت "ئەگەر موسـڵمان نەبوومایـە دەبوومە پیاوێکی شێت"[٣٧].

دوای ئەمە مالکۆڵم لە دەمەتەقێیە هەفتانەکەی ناو بەندیخانە بەشداری کرد، هەرچەندە وەکو ڕۆشـنبیرێك قسەی نەدەکرد بەڵام بەدەموزمان بوو، هەموو قسەکانیشی دەربارەی مێژووی ڕەشەکان و ئەو چەوسـاندنەوەیەی تووشی ببوون و تووش دەبن.

[37]D.David TéléObs. 141,p.3.

ئەم کارانەی ماڵکۆڵم بیوونە هۆی ئەوەی لێپرسراوان لەبەندیخانەدا نەهێڵنەوە، بیانوویەکیان لێ گرت و گەڕاندیانەوە (چارلستن) بیانووەکەش هیچ بوو: ماڵکۆڵم دەرزی لەخۆی نەدابوو.

لە (چارلستن)یشدا ماڵکۆڵم لەقسە نەکەوت. ڕۆژێك وای لەمامۆستا سپییەکەی وانەی ئاین کرد دان بنێ بەوەی کە (پۆڵس) –لەبەرئەوەی عیبری بوو– ڕەشپێست بوو (یاخود ڕەنگدار)، دوا بەدوای ئەوەش لەمامۆستاکەی پرسی: "ئەی ڕەنگی مەسیح چی بوو؟ ئەویش عیبری بوو.. وا نییە؟"

هەموو گیراوەکان ڕاست بوونەوە.. ئەمە ڕاستییەکی سەیر بوو لایان چونکە کەنیسەکان مەسیح وەکو چاوشینێکی قژ زەرد وێنە دەکەن هەرچەندە مەسیح لەرۆژهەڵاتدا لەدایك بووەو ژیاوە.

هەر ئەو شەوە ئەو قسەیە لەناو گیراوەکان بڵاوبووەوە تەنانەت لە سجنە ئینفرادییەکانیشدا.. بۆ کویش دەچوو گیراوەکان ئیشارەتی پشتگیری کردنیان بۆ دەکرد.

هەر دەرفەتێکیش بۆ ماڵکۆڵم دەرەخسا لەڕەشێك نزیك ببێتەوە پێی دەوت: "پێم بڵێ.. کابرایەکت بیستووە ناوی ئێلیجا بێ؟"

## بانگەواز بۆ ئیسلام

ماڵکۆڵم پاش حەوت ساڵ بەرەڵا کرا، واتا سێ ساڵ پێش تەواوکردنی ماوەکە، خۆی دەڵێ: دیار بوو بەرپرسان وایان بەباش زانی لەدەرەوەی بەندیخانەدا بێ نەك لە ناوەوەی.

ماڵکۆڵم چووە (دیترۆیت) لای (وێلفرێد)ی برای و لای جوولەکەیەك کاری کرد، ماڵکۆڵم بینی چۆن جولەکەکان دەستی ڕەشپێستان دەبڕن، جوولەکە شت بەقەرز دەدەنە ڕەشەکان –ڕەشەکانیش بەدوای شتی وادا دەگەڕان– بەڵام بە سێ یان چوار ئەوەندەی نرخی ڕاستی شتەکە. برە زۆرەکەی سووەکەش لەعەقدەکەدا بەپیتی وا بچووك دەنووسرا کە نەدەخوێنرایەوە.

ماڵکۆڵم یەکتر خۆشویستن و ڕێزگرتنی موسڵمانانی بینی، چووە ناو جیهانێکی نوێی پاکی دوور لەو گەندەڵییە بەربڵاوەی کۆمەڵگەی ئەمەریکی. لەماڵی براکەشیدا تامی ژیانی ناو خێزانێکی ئیسلامیی چەشت، کڕنووشی داو سوپاسی خودای کرد.

ماڵکۆڵم بیری لە برا ڕەشەکانی دەکردەوە کەلەناو گۆمدا دەژیان و کەتا دوێنێ خۆی یەکێك لەوان بوو. ویستی گەورەترین ژمارەیان بانگ بکرێن و بایەخێکی گەورەتریان پێ بدرێ، (ئێلیجا) ئەمەی پێ خۆش بوو پێی وت کەخۆی لەگەڵ لاوەکاندا خەریك بکات.

(ئێلیجا) یەکەم کەس بوو کە ماڵکۆڵم لێی بترسێ بەڵام ئەو ترسە وەکو ترسی تر نەبوو. ماڵکۆڵم (ئێلیجا)ی دەبینی بەدەستی خۆی گسك لە دوکانەکانی موسڵمانە ڕەشەکان دەداو فێریان دەکات کە تەمەڵی گوناهە، ئەوەش کە زیاتر لەمێشکی ماڵکۆڵمدا چەسپیبوو نموونەیەکی (ئێلیجا) بوو کە پەرداخێك ئاوی پیس و پەرداخێك ئاوی پاکی داناو وتی: ئەگەر بتەوێ بیروباوەڕەکانم بچێنی قسەی خراپ بەو کەسە مەڵێ کە پەرداخەکەی پیسە. هەر ئەوەندە پەرداخە پاکەکەی خۆتی پێ پیشان بدە.

ماڵکۆڵم دەڵێ: بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پەیڕەوی ئەم ئامۆژگارییەم نەدەکرد چونکە هەمیشە حەزم دەکرد دەمەقاڵە بکەمو بە خەڵك بڵێم پەرداخەکەتان پیسە!

(ئێلێجا) زۆر ئامۆژگاریی دەکرد کە دەبێ پەلە نەکات بەڵام ماڵکۆڵم ئارامی نەدەما کاتێك ڕەشەکانی دەبینی بەو شێوەیە نوقمی زەلکاو ببوون.

چالاکییە بێوچانەکەی ماڵکۆڵم بووە هۆی زۆربوونی ژمارەی ئەندامانی (نەتەوەی ئیسلام).

دوای ساڵێکیش بووە (پاستوور)ی[٣٨] پەرستگەی ژمارە (١) لە (دیترۆیت)دا.

ماڵکۆڵم هەموو ئێوارەیەك بۆ "ڕاو" دەچوو. خەریك بوو مێشکی دەتەقی کەدەیبینی ڕەشە گومڕاکان گوێ ناگرن بۆ ئەو کەسانەی هاتوون لەو تاریکییە دەریان بێنن.

موسڵمانان لەبارو چایخانەکاندا بەدوای تلیاکخۆران و لادەران دەگەڕان بۆ چاککردنیان، موسڵمانان زۆر بەئارام بوون لەگەڵ تلیاکخۆران و جاری وا بوو ساڵێکیان پێ دەچوو بۆ چارەسەرکردنی یەك تلیاکخۆر.

موسڵمانان ڕێگایەکی تایبەتیان هەبوو. ماوەیەك لەگەڵ تلیاکخۆرەکە خەریك دەبوون تا ئەو ڕاستییە لەمێشکیدا دەچەسپی:"کارەکەت هەڵەیەو بەهۆی پیاوی سپییەوە وات لێهاتووە"، لە قۆناغێکی دیاریکراویشدا پێی دەوترا ببێتە ئەندامێکی (نەتەوەی ئیسلام) تا لە تلیاك ڕزگاری ببێ، دواییش بانگ دەکرا بۆ چێشتخانەی ئیسلامی، لەوێشدا موسڵمانی ڕەشپێستی خاوەن کەرامەت و ڕێزگرتن دەبینی، تەماشا دەکرد بە (برا)و (کاك) بانگ دەکرێ، تلیاکخۆر دوای ئەمە بڕیاری دەدا واز لە تلیاك بێنێ، بەهۆی وەستانیش لەتلیاکخواردن تووشی ئازارێکی گەورەی وەك گیانەلا دەبوو، برا موسڵمانەکانیش شەوو ڕۆژ بەنۆرە بەدیارییەوە دەمان تا بەم قۆناغەدا تێدەپەڕی، ئەگەر تلیاکخۆرەکەش ئافرەت بێ، خوشکانی موسڵمانی لەگەڵدا دەبوون.

هەر ئەم تلیاکخۆرانەش خۆیان دوای ڕزگاربوونیان دەچنەوە ناو برا ڕەشەکانیان بۆ "ڕاو"و دەبنە هۆی ڕزگاربوونی ژمارەیەکی تر.

ماڵکۆڵم دەڵێ کەوا کاری موسڵمان ئەوەندە سەرکەوتوو بوو دەزگاکانی تەندروستیی سەر بە حکومەت دەیانویست بزانن چۆن موسڵمانان لەم بوارەدا کار دەکەن[٣٩] ماڵکۆڵم داخی ئەوە دەخوات کە لە جیاتی سوپاس کردن هێرشیان دەبرایە سەر لەکاتێکدا ئەگەر پێست سپییەك یان ڕەشێك کە سپییەکان "لێی ڕازین" چارەسەرێکی وا بدۆزنەوە ستایش دەکران و خەڵاتیان دەدرایە.

موسڵمانان سوودێکی گەورەیان بەکۆمەڵگە دەگەیاند:

"پێم وترا کەوا ئەو تاوانانەی تلیاکخۆران دەیکەن لە نیویۆرکدا (ساڵی) بایی چەند ملیار دۆلارێکە"

ئەوەش چونکە تلیاکخۆر کار ناکات بەڵکو دزی دەکات، ئافرەتیش وردە دزی دەکات یان دەبێتە لەشفرۆش.

ئەندامانی نەتەوە ڕوویان دەکردە شوێنی جۆراوجۆر بۆ "ڕاو". ماڵکۆڵم دەڵێ کەوا بۆیان دەرکەوت باشترین جۆرە "نێچیر" ئەوانەن کە ڕوو دەکەنە کەنیسەکان. موسڵمانەکان نزیك نەدەکەوتنەوە لە کەنیسە گەورەکان کە

---

[٣٨] ئەو کاتە بۆ (ئیمام) وشەی پاستووریان بەکاردەهێنا کەناوی قەشەی لقێکی نەصرانییەتە.

[٣٩] تا ئەم کاتە سەرکەوتوویی موسڵمانان بەردەوامە.

بەزۆری ڕەشپێستە "بورجوازییەکان" ڕوویان تێدەکردن.. ئەمانە زۆر لەخۆیان بایی ببوونو زۆر مەبەستیان بوو پلەو پایەی خۆیان بپارێزن.

زۆری ئەو کەسانەش کە لە کەنیسە بچووکەکان "ڕاو دەکران" ئافرەت بوون، لەکاتێکدا پیاوەکانیان لە کۆبوونەوەکانی قەومییە ڕەشەکان ڕاو دەکرد. ماڵکۆڵم قسەی بۆ ئەو ئافرەتانە دەکرد:

"پیاوی ڕەشپێست ڕێزی دەست ناکەوێ تا فێر نەبێ چۆن ڕێز لە ئافرەتی ڕەشپێست بگرێ"

پاش قسەکردن بۆیان داوایان لێ دەکات هەریەکێك بڕوای بەو قسانە هەیە هەڵسێتە سەرپێ: هەمووشیان هەڵدەستان بەڵام کە دەیووت ئەوەی ئامادەیە شوێنی ئێلیجا بکەوێ با هەڵسێتە سەرپێ زۆر کەمیان هەڵدەستان.

ئەو ئافرەتانە بەر لەهەموو شتێك لەبنەما ئەخلاقییەکانی نەتەوە دەترسان چونکە نەدەبووایە موسڵمانی ڕەشپێست مەشروب بخواتەوە یان زینا بکات یان گۆشتی بەراز بخوات یان جگەرە بکێشێ و تلیاك بەکاربهێنێ یان دزی بکاتو درۆ بکات یان ڕەفتاری خراپی هەبێت لەناو خێزانی خۆیدا بەتایبەتی لەگەڵ ئافرەتدا.

ماڵکۆڵم سوور دەبوو لەسەر ڕوونکردنەوەی هۆکانی پەسەندکردنی ئەم بنەمایانە:

"سپیپێست دەیەوێ ڕەشپێست وەکو مرۆڤێکی بێ ڕەوشت، پیس، نەزان، بمێنێتەوە، چەندیش ئاوا بمێنینەوە هەر دەبێ لەسەر ئەژنۆ چۆك دابدەینو پیاوی سپیپێست وەکو ئاغای ئێمە بمێنێتەوە"[40]

ئێلیجا ماڵکۆڵمی بۆ (بۆستن) لای برا (لۆید ئێکس) نارد، پاش سێ مانگ توانیان مزگەوتێکی بچووك لەوێدا بکەنەوە، ئێلاّی خوشکیشی بۆ یەکەم جار هات بۆ گوێ گرتن، بڕوای نەدەکرد ئەوەی بۆ خەڵك قسە دەکات ماڵکۆڵمی برایەتی. ماڵکۆڵم گۆڕانێکی گەورەی وای بەسەردا هاتبوو کە لە بڕوای ئێلاّدا نەبوو ڕوو بدات. ئێلاّ دوای پێنج ساڵ بووە موسڵمان.

پاشان ماڵکۆڵم بووە پاستووری پەرستگای ژمارە (١)ی شاری (فیلادێلفیا)، دوای مانگێکیش بووە پاستووری پەرستگای (٧)ی نیویۆرك ئەویش دوکانێکی بچووك بوو کرایە مزگەوت. زۆر خۆش حاڵ بوو چونکە دەیزانی کاری چاك لە (هارلم)ی نیویۆرکدا دەکرێ، بەم جۆرەش ماڵکۆڵم گەڕایەوە هارلم بەڵام چۆن گەڕانەوەیەك.

لەم کاتانەدا بەملاو بەولادا گەشتی دەکرد، هەموو چوارشەممەیەك وتاری لەپەرستگەی (١٢)ی فیلادێلفیادا هەبوو، پەرستگەیەکی لە شاری (سپرنگفیلد)ی (ماستچوسێتس) دانا ئەویش بەیارمەتیی (ئۆسبۆرن ئێکس) کە لەسەر دەستی ئەو لەبەندیخانەدا بووە موسڵمان. ئافرەتێکیش بانگی کرد بۆ شاری (هارتفۆرد)و (١٥) ئافرەتی خزمەتکاری تریان بانگ کردو بەم جۆرە پەرستگای ژمارە (١٤)ی شاری هارتفۆرد کرایەوە. دوایی یارمەتی برایانی دا لە کردنەوەی پەرستگای (١٥)ی (ئەتلانتا). وەك دەشڵێ زیاد لەسەد مزگەوتی دامەزراند یان یارمەتیی موسڵمانانی دا لە دامەزراندنیان.

---

[40] ئەمەش کاری داگیرکەری ڕۆژئاواییە لەکۆنو نوێدا: دەیەوێ هیچ بەهایەکی ڕەوشتی نەمێنێ لە وڵاتە بچووکەکاندا تا گەلەکەو بەتایبەتی لاوان نوقمی ئارەزوو بنو توانی بەرگریان نەمێنێو ئەو ئاغایەتییەکەی خۆی بسەپێنێ، زۆریش لەمێشك سڕاوە ئارەزوو پەرستەکانی لای خۆمان ئامادەی ئەمەن.

ژمارەی ئەندامانی نەتەوەو ئەوانەی ئەندام نەبوون یان هەر موسڵمان نەبوون و بۆ گوێگرتن دەچوون لەزۆربووندا بوو. ئەوساش پەرستگەی ژمارە (١) لە (دیترۆیت)دا شانازیی بەوە دەکرد کاروانێکی دە سەیارەیی بنێرێتە شیکاگۆ بۆ گوێگرتن لە ئێلیجا بەڵام پاش ئەوە ناوچەکانی کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەمریکا ١٥٠و ٢٠٠ و تەنانەت ٣٠٠ پاسیان دەنارد جگە لەسەدان کەس کە بە سەیارەی خۆیان دەچوون.

ماڵکۆڵم (بیتی ئێکس)ی مارەکرد، (بیتی) یەکێك بوو لەچەندین ئافرەتی تر کە بەهۆی موسڵمان بوونیانەوە تووشی کێشە ببوون لەگەڵ خێزانەکانیان. کەسوکاری بیتی، کە بەخێویان کردبوو، ناچاریان کرد یان واز لە ئیسلام بێنێ یان خوێندنی تەواو نەکات بەڵام ئەو خۆڕاگربوو، کارێکیشی دۆزییەوە تا ئەو کاتەی لەگەڵ کەسوکاریدا بەینی چاك بووەوە[٤١].

تا ئەو ساڵە کەس لەنیویۆرکدا ناوی (نەتەوە)ی نەبیستبوو تا ڕووداوێك بووە هۆی ناساندنی (نەتەوە) بەخەڵك. (جۆن هنتۆن)ی موسڵمانی ڕەش لەلایەن پۆلیسەکانەوە تەعدای لێ کرابوو، وەڵامی موسڵمانان ڕێکخراو و پتەوبوو، دواییش توانییان ٧٠هەزار دۆلار وەك قەرەبوو دەست بکەوێ کە زۆرترین پارە بوو بدرێتە ڕەشپێستێك.

دوو شتی تر ناوبانگیان دایە (نەتەوە): کتێبەکەی ئێریك لنکۆڵن: (موسڵمانە ڕەشەکانی ئەمریکا)، کەلەسەرەتادا نامەی دکتۆرا بوو، دووەمیش فیلمێکی تەلەفزیۆنی دەربارەی (نەتەوە)، ئەم فیلمە سپییەکانی تۆقاند، ڕۆژنامەکانیش ڕشانەوە: "کینە.. کینە"، "دوژمنانی مەسیح"، "نێردراوانی کینە"، "فاشیستی ڕەش"..

جاشە ڕەشەکانیش دەیانزانی چی بڵێن، پێویستیان بە فەرمان نەبوو، فێرکرابوو چی بکەن لە باری وادا.

ئێلیجا هەمیشە داوای لە موسڵمانان دەکرد بە ئارام بن و وەڵامی هێرشەکانی پێشەوا ڕەشەکان نەدەنەوە نەوەکو یەکریزیی ڕەشەکان تێك بچێ بەڵام هێرشەکانی ئەمان زۆرترو دڕندانەتر دەبوو تا ئێلیجا ئارامی نەماو فەرمانی دا وەڵامیان بدرێتەوە.

ماڵکۆڵم باشترین وەڵام دەرەوەی دوژمنان بوو، وەکو ڕۆژنامەنووسێکی سپیش دەڵێ: سەرکەوتوویی ماڵکۆڵم لەتەلەفزیۆن و لەکۆبوونەوە گەورەکاندا ترسی دەخستە دڵەوە، لەکۆتاییشدا زۆر لەدوژمنە ڕەشەکانی بێدەنگ دەبوون لەو کاتەی ئەو قسەی دەکردو گوێگرە سپییەکانیش دەپەشۆکان.

ماڵکۆڵم وەسفی یەکەم مێزگرد لەستۆدیۆدا دەکات کە بۆ ئەو و بۆ ڕەشپێست و سپیپێستی لایەنگری "تێکەڵبوون" گیرابوو.

شەیتانە سپیپێستەکان و بووکەشووشەکانی سەر شانۆی سەربەوان گەمەی هاوڕێتییان تەمسیل دەکرد.. گاڵتەیان لەگەڵ یەکتر دەکردو بەناوی یەکەم یەکتریان بانگ دەکرد.

---

[٤١] یەکێك لە کێشەکانی ئافرەت ئەو فشارەیە کە کەسوکاری یان کۆمەڵگە دەیکەن کاتێك موسڵمان دەبێت، ئەم فشارە تەنانەت لە کۆمەڵگە موسڵمانەکانیشدا هەیە کاتێك ئافرەتێك بڕیار دەدات حجاب بپۆشێ و لە هەندێك وڵاتدا دەگاتە ئاستی حکومی. نموونەی ئەمە زۆرە بەڵام زیاتر تەرکیز دەکرێتە سەر ئەو خێزانانەی زۆر لە کچەکانیان دەکەن خۆیان بپۆشن.

"ئای لەم درۆیانە! ئەمە وای لێدەکردم حەز بکەم بڕشێمەوە"

تەنانەت لەگەڵ ئەویشدا خۆیان وەکو هاوڕێ پیشان دەدا لەکاتێکدا ئەوان بۆیە لەو ستۆدیۆیەدان "بۆ ئەوەی ڕیخۆڵەکانم دەربهێنن".

هەرئەوەندەش وشەی "جیابوونەوە"ی بەزماندا هات هاوارییان لێ هەڵسا "ئێوە بانگەواز بۆ ئەو شتە دەکەن کە ڕەگەزپەرستە سپییەکان داوای دەکەن".. ئەویش جیاوازییەکەی ڕوون دەکردەوە:

"ئێمە کەمتر لە ئێوە جیاوازیمان دەوێت.. ئێمە داوای جیابوونەوە دەکەین.. ئەمەش هەمان واتا ناگەیەنێت (..) جیاکردنەوەی ڕەگەزپەرست بریتییە لەو دەست بەسەرداگرتنەی کە بەرزەکان بەسەر نزمەکاندا دەیسەپێنن لەکاتێکدا جیابوونەوەی ئەنجامی ڕێکەوتنی نێوان دوو لاینی یەکسانە"

دوای ئەم مێزگردە یەکەمە مێزگردەکان بەردەوام بوون و زۆرتر دەبوون:

"لەهەموو جارێکیشدا خۆم لەناو ستۆدیۆدا دەبینییەوە دەچوومە تەنیشت ئەو بووکەشووشە ڕەشانەی شەیدای تێکەڵبوون و شەیدای مێشکسڕینەوەن و هەموو جارێك ئەو شەیتانانە (سپییەکان) هەوڵیان دەدا پێستم کەوڵ بکەن.."

ڕەخنەکانی مالْکۆلْم نزمێتیی پێشەوا ڕەشەکانی ژێر دەسەڵاتی سپییەکانی دەردەخست.. مالْکۆلْم باسی (ڕێپێوان بۆ واشنتن) دەکات کە کارێکی جەماوەری بوو و حکومەتی ئەمەریکیی تۆقاند بەڵام حکومەت توانی کارێك بکات ئەو "پێشەوایانە" دەست بەسەر ڕێپێوانەکەدا بگرن و بیکەنە سێرك[٤٢].

ڕێکخراوە ڕەشەکان پێشبڕکێیان بوو لەسەر دەستکەوتنی پارە تا ئەوکاتەی سپیپێستێك پێی وتن کەئەم شەڕە لەسەر چەند فلسێك پایەی ڕێکخراوەکان دەخاتە مەترسی، ئەوانیش خۆیان یەك خست و ٨٠٠ هەزار دۆلاریان دەستکەوت.. پارەی سپیپێستەکان بۆ ئەوەبوو ڕەشەکان ئامۆژگاری بکرێن کە هێمن بن و "نەیقەومێنن". چەند ناودارێکی سپی لە ڕێپێوانەکەدا ئامادەبوون ئینجا "تێکەڵبوونخوازان" -کە تا دوێنێ ڕێپێوانەکەیان بەدڵ نەبوو- پاڵپشتیان کرد.. هەریەکێکیان دەیویست پیشانی بدات کە ئەو یەکەم کەسە بەشداری دەکات، دروشم و لافیتەو سروودیان بۆ ئامادەکرابوو، هەموو شتێکیان بۆ ئامادەکرابوو تەنانەت بۆشیان دیاریکرابوو "لەکوێدا لەهۆش خۆیان بکەون".

[٤٢] دەستگرتن بەسەر جموجوولە جەماوەرییەکان بەهۆی چەند کەسایەتییەك کە مەبەستی یەکەمیان ڕەزامەندیی دەسەڵاتە شتێکە زۆر بینراوە، هەر لە کوردستانی خۆماندا سەرنجی ئەو جموجوولەی بۆ دیاریکردنی چارەنووسی کوردستان پاش نەمانی ڕژێمی سەددام کراو تێبینی بکە چۆن لەبار برا.

ڕێپێوانی گەل کرایە شانۆییەکی کۆمیدی، ئەو ئەندامانەی کۆنگرسیش کە دژی مافە مەدەنییەکانی ڕەشەکانن لەسەر ڕای خۆیان مانەوەو ڕای خۆیان هەر نەگۆڕی.. ئەم مافانەی کە هیچ نرخێکیان نییە بە ڕەشەکان ڕەوا نەزانران:

"ئێمە لەئەمریکادا بەباشی دەزانین پەنا بەرینە بەر فێڵو بەدوای کەلەبەرێك بۆ خۆ دەربازکردن، ئێمە بەرەورووی کێشە ڕاستەقینەکان ناوەستین"[43].

ڕەشەکان هێمن کرانەوە بەلاّم هەر دەبوایە بیانزانیایە کە ئەم جارەش دیسان سپییەکان گرەوەکەیان بردەوە بۆیە جارێکی تر تەقینەوە، بەم جۆرەش لە "هاوینی دوورودرێژی سووتێنەر"ی ١٩٦٤ قەوما بەلاّم قەومانی ئەم جارە خراپتر بوو.

کۆبوونەوە گشتییەکان (نەتەوەی ئیسلام) بەردەوام گەورەتر دەبوون، ئەوەتا لەکۆبوونەوەیەکدا دە هەزار ڕەش هاتبوون، بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە کۆبوونەوەکە بەڕێوە برا، ئیمامی مزگەوتەکان دەهاتنو بەتەوقە لەگەڵ یەکترو بە "السلام علیکم" سلاّویان لەیەکتر دەکرد. چەند کەسێك قسەیان دەکرد:

"جۆن عەلی سکرتێری نەتەوە یان لویس ئێکس قسە دەکەن یان خوشکە تاینیتا باسی بەشدارییە سەرەکییە گرنگەکەی ئافرەتی موسڵمان لەنەتەوەدا دەکات".

دوای ئەوەش ماڵکۆڵم بەخێرهاتنی (ئێلیجا) دەکرد ئەویش دێتو سلاّویان لیٚ دەکات: "السلام علیکم"، موسڵمانانیش بەیەك دەنگ وەلاّمی دەدەنەوە: "السلام علیکم".

وتارە گەرمەکەی (ئێلیجا)و وەلاّمەکانی دانیشتوان (تەنانەت ڕەشپێستە نەصرانییەکانیش وەلاّمیان دەدایەوە) وای لەکۆبوونەوەکە دەکرد "لەدانیشتنی دەوری ئاگری سەربازگە بچیٚ".

لەم کۆبوونەوە گشتییانەدا ڕێگە بە سپیپێستەکان نەدەدرا ئامادە بن. بۆیە پێشەوا ڕەشپێستەکان هێرشیان دەبردە سەر نەتەوە "بانگخوازانی جیاکردنەوەی ڕەگەز پەرستی ڕەش!ڕەگەزپەرستان" .. چەند سەیرە:

"ئەمە لەکاتێکدا جیاکردن دژی ڕەشپێستەکان لەسەرتاسەری ئەمریکادا پیادە دەکرێت".

---

[43] ڕووداوەکانی ئەم ڕۆژانەمان ئەمە دەسەلمێنیٚ: ئەمەریکا سوور دەزانیٚ کورد ویستبووی نەك تەنها لە سەددام ڕزگاری ببیٚ بەڵکو هەروەها شتێکی زیاتری دەستبکەویٚ کەچی خۆی لە داواکارییەکانی کورد گێل دەکات، ئەمەریکا دەزانیٚ ئەو پشتیوانییە بێسنوورەی بۆ ئیسرائیلو بێدەنگبوونی لە تاوانەکانی ڕقێکی گەورەی بۆ دوستکردووە لە جیهانی ئیسلامیداو هۆی سەرەکییە بۆ ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەر بەلاّم خۆی گێل دەکاتو پشتیوانییەکە (بەم جۆرەش ڕقی موسڵمانان) زیاتر دەکات، هەروەها داگیرکردنی عیراق هۆی ئەو هەموو کوشتارو نەهامەتییانە بوو و بەشی زۆری عیراقییەکان دژ بە ئەمەریکان بەلاّم هێشتا جۆرج بوشی کوڕ خۆی گێل دەکاتو باسی هێنانی ئازادی بۆ عیراق دەکات. ئەمەریکاش بەدرێژایی مێژووی پشتیوانیی دیکتاتۆرەکانی کردووەو ئەو پشتیوانییەی بۆتە هۆی ئەوەی گەلان زیاتر ڕقی لیٚ هەڵگرنو ڕووبکەنە دوژمنەکانی (ئەو کاتە یەکێتیی سۆڤیێتو وڵاتە سۆشیالستەکان بەگشتی)و زیاتر ڕوو بکەنە ئەو ئایدیۆلۆجیایەی کە ئەمەریکا بە هەڕەشەی دەزانی (ئەو کاتە مارکسیەت) بەلاّم ئەمەریکا هەر سوور بوو لەسەر ئەو سیاسەتانەیو لەسەر ئەو خۆ گێلکردنە.

لەکۆبوونەوەکاندا ماڵکۆڵم سەرانی F.B.I و پۆلیسی نهێنی تری دەناسییەوە. جگە لەم هاتنەیان بەدزیەوە ئەمانە بە ئاشکرایی بۆ پرسیارکردن دەهاتنە لای موسڵمانان، ئێلیجا نەدەترسا: "چیم پێویستە هەمە، ئەویش ڕاستی". باشترین سیخوڕ مرۆڤی ڕەشپێست بوو، جاش باشترین ئامێرە، بەڵام چونکە بزوتنەوە ئیسلامییەکە بزوتنەوەی ڕابوون بوو ئەو سیخوڕانە کە دەهاتن و گوێیان دەگرت و ڕاستییەکەیان دەزانی وازیان لە سیخوڕی دەهێنا یان لای دەزگای موخابەرات دەمانەوەو هەواڵیان بۆ برا ڕەشەکانیان دەبرد، ئەمە لەکاتێکدا دەستی ئەم دەزگایانە گەیشتبووە بەرزترین ئاست، ئاستی پێشەوایان، لەبزوتنەوە ڕەشەکانی تردا، ئەمانە ڕێکخراوی خەوی تلیاکاوی و نۆکەرایەتی بوو.

## ئیسلامی ڕاستەقینە

ئێلیجا محمد پیر ببوو، کۆبوونەوەو وەستانی زۆر ماندووی کردبوو لەبەرئەوە لەجاران زیاتر پشتی بە ماڵکۆڵم دەبەست بۆ ئەو بڕیارو کاروبارانەی کە زۆر گەورە نەبوون، ئێلیجا پێی وتبوو: دەمەوێ بەناوبانگ بیت بەڵام بزانە کە مرۆڤی ناودار حەسوود بۆ خۆی دروست دەکات.

ماڵکۆڵم دەڵێ لە ساڵی (١٩٦١)ەوە دەیبیست کە لە پاشەملە باسی دەکرێ گوایە دەیویست ئەو ببێتە خاوەنی (نەتەوە)، شتێك کەقەت لە ماڵکۆڵمی خەمخۆری گەلەکەی نەدەوەشایەوە.

ماڵکۆڵم پێشتر قسەی بیستبوو لەبارەی کاری نارەوای ئێلیجا بەڵام هەرگیز ئەم قسانە کاریان تێ نەدەکرد، بڕوای بە ئێلیجا قایم بوو، بەڵام لەماوەی ساردبوونی پێوەندییەکەی بە ئێلیجاوە قسەکان کارێکی تێکدەریان هەبوو:

"خەوی ناخۆشم دەبینی، مێردزمە بەناونیشانی گەوەرەوە"

ناچار بوو، چووە لای والاس محمد کوڕی ئێلیجا بۆ "فریاکەوتنی باوکی" والاسیش پێی وت کە لەوە ناچێ باوکی پێویستی بەیارمەتی بێ. دواییش ئێلیجای بینی و بۆی گێڕایەوە چی لەبارەیەوە دەوترێ، وەکو باوك و کوڕێکیش قسەیان لەگەڵ یەکتر کرد.

کوشتنی سەرۆك جۆن کێنێدی (١٩٦٣) برینەکەی قووڵتر کرد، ئێلیجا فەرمانی دابوو کەس لە موسڵمانان لەم بارەیەوە هیچ نەڵێ، بەڵام کە ڕۆژنامەگەرێك لەماڵکۆڵمی پرسی ئەو وەڵامی دایەوە کە کوشتنی کێنێدی ئەو پەندەی بەسەردا دەچەسپێ کە دەڵێ "مریشکەکان دەگەڕێنەوە کولانەکەی خۆیان" واتا کینە چەکێکی کوشندەیە دەگەڕێتەوە ملی خاوەنەکەی.. کینەی مرۆڤی سپیپێست، ئەم جارە مرۆڤێکی سپیپێستی تلانەوە.

ڕۆژی دواتر ئەم قسەیە لەڕۆژنامەکاندا بڵاوکرایەوە، کە ماڵکۆڵمیش چووە لای ئێلیجا لۆمەی کرد: "دەزانی کە خەڵکی کێنێدییان خۆش دەویست". ئینجا فەرمانی دا کە بۆ ٩٠ ڕۆژ "قسە نەکات".

ماڵکۆڵم دەڵێ ئامانجی ئێلیجا دوورخستنەوەی بوو لە (نەتەوە). ڕۆژ بەڕۆژیش پێوەندییەکەیان خراپتر دەبوو تا ماڵکۆڵم جیا بووەوەو ڕێکخراوی "یەکێتی ئەفرۆ – ئەمریکییەکان"ی دامەزراندو کەمێك لەهاوڕێ کۆنەکانی چوونە پاڵی. بەم جۆرەش.. دەسەڵاتدارانی ئەمریکا توانییان پێوەندی نێوان دوو پێشەواکەی (نەتەوە) تێك بدەن دوای ئەوەی سەرکەوتوو نەبوون لەوەستانی ڕاستەوخۆ بەرامبەری.. بەڵام دوای کوشتنی

ماڵکۆڵم هەوڵی پێك دادانی دوو ڕێکخراوەکە بەهۆی کوشتنەکە سەری نەگرت و هەردوو ڕێکخراوەکە پێوەندی نێوانیان چاککرد.

ماڵکۆڵم زۆری دەبیست لەموسڵمانانی تر، ئەوانەی دەهاتنە ئەمریکا یان لەوێدا دەژیان، لەبارەی ئیسلامی ڕاستەقینەوە "ئەگەر ئیسلامی ڕاستەقینە بناسی لێی تێ دەگەیی و وەریدەگری".

"کەقسەکانیانم دەبیست، من کە قوتابی ئێلیجا موحومەدم هەستم دەکرد وەك قژم ڕاوەستێ".

دواییش لەخۆی پرسی بۆ هێندە دوو دڵە لەوەی ئیسلام باشتر بناسێ، ئەمەی بە والاس وت ئەویش پشتگیریی کرد، بڕیاری دا حەج بکات و (ئێلّلا)ی خوشکیشی ئەو مەسرەفەی حەج کردنەی بۆ خۆی کۆیکردبووەوە دای بەو.

لە (قاهیرە)دا –پێشی چوونی بۆ حیجاز– زانی کێشەی ڕەنگ لەوێدا نییە، لای سەیر بوو "وەك چۆن لەبەندیخانەوە هاتبێتمە دەرەوە". کێشەی ڕەنگ بەزۆری لەئەمەریکادا هەیە، لای پێشەوای "ئازادی" لەجیهاندا.

ماڵکۆڵم لە (میسر)و (سعوودیە)دا لەلایەن کەسانی ئاسایی و لەلایەن دوو لێپرسراوی سعوودییەوە بەخێرهاتنی گەرمی کرا [44]، ئەوان لەچاو ماڵکۆڵم پێستسپی بوون، ماڵکۆڵم لەوێشدا ڕەگەزپەرستی و کێشەی ڕەنگی بۆ خەڵکی ڕوون کردەوە، ئەمانەو باری نامرۆڤانەی ژیانی ڕەشەکان لەئەمریکادا خەفەتی دەدایە گوێگرانی.

دیمەنی حەج زۆر کاریگەر بوو، دەیان هەزار کەس لەهەموو ڕەنگ و ڕەگەزو نەتەوەو وڵاتەوە بەدەوری "کەعبە"دا دەخولانەوە، خودا یەکەو مرۆڤایەتی یەکە، ڕژێم و بیروباوەڕەکانی تاریکستانیش دوو بەرەکی ناو مرۆڤایەتیی و دوژمنایەتی دێننە بەرهەم. ئەو برایەتییەش کە ئیسلام کاتی حەج پیشانی دەدات لەکاتێکە ئیسلام لەوڵاتانی خۆیدا نامۆیەو تەنها بەرماوەیەکە لەدڵی میللەتاندا ماوەتەوە ئەی دەبێ ئەو ڕۆژەی ببێتە یاساو فەرمانڕەوای جیهان، مرۆڤایەتی چەند ئاسوودە بێ و برا بگەڕێتەوە لای برای خۆی؟

## کـــــوژران

کاتێك ماڵکۆڵم لەدەرەوەی ئەمریکادا بوو ڕاپەڕینی "هاوینی دوورو درێژو سووتێنەر" لە (هارڵم)ی نیویۆرك و چەند شارێکی تر ڕووی دابوو، (یانەی تفەنگی سووك) دۆزرایەوە کە ماڵکۆڵم دوانزە ساڵ بوو

[44] ڕژێمەکانی ئاسیاو ئەفەریقا ئەوەندەی جەماوەر دڵگەرمی کێشەی ڕەشەکان نەبوون بۆیە سەردانەکانی ئێلیجا و ماڵکۆڵم بێ سوودێکی عەمەلی بوون. لەکاتی نامەی ئێلیجا بۆ دیکتاتۆری میسر جەمال عبدولناصرو کاتی سەردانی ماڵکۆڵم دیکتاتۆر لەبەندیخانەو قەسابخانە ناودارەکانیدا سەگەکانی بەر دەدایە موسڵمانەکان، بەڵکو دەتوانین بڵێین دیکتاتۆر ناڕەحەت بوو بەو "برایانەی ڕۆژئاوا کەلە بیرتان کردوون" چونکە لەو کاتەی توانیبووی دەنگی ئیسلام لەمیسردا بخنکێنێ موسڵمانی بۆ پەیدا بوو لەوڵاتی تر.. ئەمەیە ئیسلام لەهەر کوێیەك دەنگی کپ بکرێ لەشوێنی تردا سەربەرز دەکاتەوە " وَاللَّـهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَـوْ كَـرِهَ الْكَافِرُونَ"""الصف: ٨"

دایمەزراندبوو، هەروەها "برایانی خوێن" کەوتبوونە خەباتی چەکدارو وترابوو سەر بە مالکۆڵمن، لەبەرئەمە ڕۆژنامەگەریی سپییەکان مالکۆڵمی کردبووە هێمای شۆڕش و کاری توندوتیژیی ڕەشپێستەکانی ئەمریکا.

مالکۆڵم جارێکی تر چووە دەرەوەو سەرۆك و لێپرسراوانی زۆری ئەفەریقی و ئاسیایی بینی، دوای چوار مانگیش لە شوباتی ١٩٦٥دا گەڕایەوە ئەمریکا.

سیخوڕان هەمیشە بەدوایەوە بوون، جارێکیان ئارامی نەماو بەکابرایەکی وت کە تۆ سیخوڕی موخابەراتی مەرکەزی C.I.A و نووسینگەی توێژینەوەی فیدڕالی F.B.I ئەویش قسەی ناشیرینی پێ وت وەك: دوژمنی ئەمریکا، تێکدەر.. کاتێکیش لەقاهیرەدا بوو دەرمانخوارد کرا، کە ویستیشی سەر لە فەڕەنسا بداتەوە بۆ قسەکردن لەکۆنگرەی قوتابیانی ئەفەریقی حکومەتی فەڕەنسی ڕێگەی پێ نەدا وتارەکەی بڵێ بەڵکو تەنانەت ڕێگەی نەدا لەفەڕەنسادا "فەڕەنسای ئازادی!" بمێنێتەوە، لەوێشەوە چووە بەریتانیا.

لە ١٣ی شوباتی ١٩٦٥دا گەڕایەوە نیویۆرك، ڕۆژێکیشی پێ نەچووبوو بۆمبایەکی مۆلۆتۆڤ[٤٥] خرایە خانووەکەی کاتێك کە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا نووستبوون و خانووەکەی سووتا.

لەسەرەتادا مالکۆڵم تۆمەتی خستە پاڵ (نەتەوە) بەڵام دوایی کەوتە گومانەوە، ڕۆژێك پێش کوشتنی بە "ئەلێکس هالی" نووسەری یاداشتەکانی وت کەوا چەند بیر لەکارەکەی حکومەتی فەڕەنسا دەکاتەوە ئەوەندە بیر دەکاتەوە کە (نەتەوە) بەسووتاندنی ماڵەکەی تاوانبار نەکات، ڕۆژی دواییش (واتە ڕۆژی کوژرانی) لای چەند کەسێك دیسان تاوانەکەی لەسەر (نەتەوە) لابرد، ئەو گومانی لە دەسەڵاتێك هەبوو کەلە (نەتەوە) گەورەتر بوو[٤٦].

مالکۆڵم زووتر دەیزانی کە ناگاتە تەمەنی پیریێتی، ماوەیەك پێش کوژرانی هەستی بە نزیك بوونەوی کۆتایی ژیانی دەکرد:

"هەموو ڕۆژێك خەبەرم دەبێتەوەو دەزانم ڕۆژێکی ترم دەستکەوت، وەکو مردوویەك لەمۆڵەتدا.. دەژیم".

ڕۆژی یەك شەممەی ٢١ی شوباتی ١٩٦٥ بوو کە چووە هۆڵێکی سەما لە هارلم دا –کەهەروا بۆ کۆبوونەوەو وتار بەکار دێت چاوەڕێی چەند میوانێکی دەکرد بەڵام کەدیار نەبوون کۆڕەکەی دەست پێ کرد. (بنجامین ئێکس) نیو سەعات قسەی کرد ئینجا مالکۆڵم هەڵساو سڵاوی لێ کردن: السلام علیکم برایان خوشکان، هەندێك وەڵامیان دایەوە: وعلیکم السلام.

لەو کاتەدا دەنگەدەنگ بەرز بووەوەو هەندێك کەس پێکاچوون، مالکۆڵمیش ویستی هێمنیان بکاتەوە بەڵام لەلایەکی تری هۆڵەکەوە تەقەی لێ کرا.. بەقسەی ئافرەتێکیش تەقەکەران سێ کەس بوون.. زیاد لە ١٥ فیشەکی بەرکەوت، پۆلیسێکیش کابرایەکی گرت.

---

[٤٥] بۆمبایەکی سووتێنەرەو بریتییە لە شووشەیەکی پڕ لە بەنزین یان بەنزین و قیر ی تێ دەکرێ.

[٤٦] بەڵام نووسەرێك لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانی ئەم قسەیەی مالکۆڵم نانووسێ..ئایا بۆ ئەوەی (نەتەوە) تاوانبار بکرێ؟
Encyclopaedia Britannica, Micropaedia, Ready Reference and Index, VI, p.530

کابرای گیراو، (تالماجا هایەر) دانی بەوەدا نا کە "کەسێك" ئەوو کەسانی تری بەکرێ گرت بۆ کوشتنی ماڵکۆڵم، نەیووت کێن بەڵام هەرئەوەندەی وت کەسیان موسڵمان نەبوون، دادگاش گوێی نەدایە ئەم قسانەو هەر حوکمی ئەو دوو موسڵمانەی دا کە لەگەڵ (هایەر)دا گیرابوون وەك چۆن ویستبێتی بە زۆر (نەتەوە) تاوانبار بکات.

## ئەمە بوو ماڵکۆڵم ئێکس

دوای مردنی ئێلیجا (نەتەوە) هاتە سەر بیروباوەڕی ماڵکۆڵم، ڕێبازەکەی ماڵکۆڵم سەرکەوت، مزگەوتەکەی نیویۆرك بووە (مزگەوتی ماڵکۆڵم ئێکس)، بووە شایەتی خەبات و قوربانیدانی بێدارکەرەوەیەکی گەلان.

جیمس شاباز –سکرتێری تایبەتی ماڵکۆڵم– دەڵێ:

"دڕکێك بوو لەپێی دەزگایەکی گەورەی دەسەڵاتدار کەبڕیاری دابوو دژی گەلە غەیرە سپییەکانی تری ئاسیا بجەنگێ"

ماڵکۆڵم ناونرابوو "ڕەشی تووڕەی ژمارە یەك"، هەقیشی بوو تووڕە ببێ، کاتی خۆی کوشتەی دەستی کۆمەڵگەی ئەمەریکی بوو، گەلەکەی خەسێنرابوو.. کاتێکیش زانی کەوا "تووڕەبوون هەندێك جار کوێرە" تووڕەییەکەی دژی دەسەڵاتدارانی ئەمریکا وەکو خۆی مایەوە، دوای چوون بۆ حەج و فرێدانی بەرگی "ڕەش پەرستی".. "کۆمەڵگەی ئەمەریکی لەجاران زیاتر ڕەفز دەکرد، بەڵام ئەم جارە بەشێوەیەکی تر".

لەو بڕوایەدا نەبوو بتوانرێ کۆمەڵگەی ئەمریکی چاك بکرێ، پێویست بوو "شۆڕشی تیدا بەرپا بکرێ". ماڵکۆڵمی "ئومەمی و نەیاری سەرمایەداری و ئیمپریالیزم ببووە مەترسییەکی گەورە.. دەبوایە بەهەر نرخێك بووایە بکوژرایە".

دیاربوو بڕیارەکە لە F.B.I و C.I.A وە دەرچووبوو ماڵکۆڵمیش نەلەوان و نەلە مردن نەدەترساو لەوکاتەوە باوکیان کوشت تا ئەوکاتەی کاری قەدەغەی دەکرد تا کاتی موسڵمانبوونی ژیانی پڕ مەترسی بوو، لەو بڕوایەدا نەبوو زۆر بژی.

ماڵکۆڵم خۆشەویستی ڕەشان بوو، بەتایبەتی هەژاران و هونەرمەندان.

هونەرمەندێکی ناموسڵمان دەیوت:

"ماڵکۆڵم قەد خیانەتمان لێ ناکات.. خیانەتی زۆرمان لێ کراوە"

هونەرمەندێکی تر:

"زۆر ڕەش هەن لەگەڵ بیرو باوەڕەکانیدا نین بەڵام هەموویان دەزانن ئەو پیاو بوو، سپییەکان کەسیان ناوێ بیریان بخاتەوە کە پیاون بەڵام ئێمە دەمانەوێ.. ئەو فێری کردین (..) وتی: ئێوە چۆکتان داداوە، هەڵسن و پاڵەپەستۆ بکەن..".

ماڵکۆڵم ترسی خستبووە دڵی دوژمنەکانی، ڕۆژنامەگەرێکی سپی دەڵێ:

"تا ئێستا کەس ڕق و ترسی نەختستۆتە دڵی مرۆڤی سپیپێست ئەوەندەی ئەو چونکە مرۆڤی سپیپێست دەیزانی ماڵکۆڵم نەدەکڕدرا".

ژنی ڕۆژنامەنووسەکە دوای دانیشتنێك و چا خواردنەوەیەك لەگەڵ ماڵکۆڵمدا بە مێردەکەی وت:

"وای لیَ کردم هەست بکەم لەگەڵ پڵنگێکی ڕەشدا چام خواردبیَ".

ڕاستە:

پڵنگێکی ڕەش بوو.. ئەگەر ببینی چۆن زەردەخەنەکەی هەموو دانەکانی دەردەخات دەڵێی: چەند منداڵێکی دڵپاك و بیَ وەیە! نازانی دەوڵەتێکی تۆقاندبوو:

ڕاستە: پڵنگێکی ڕەش بوو:

ئەوکەسەی هاواری دەکرد: ئەو ڕەشەی دەتانناسی مرد.

ئەو کەسەی بەرەو ڕووی گەورەترین دەسەڵات وەستا..

هەڵگری پەیامی ڕاپەرینی گەلانی ستەملێکراو..

هەڵگری دوو هێزە گەورەکە:

شۆڕش و برایەتی..

ماڵکۆڵم ئێکس.